# پەروەردە کردنی



# منداڵانی ئازاد و سەربەخۆ





بەرگی یەکەم

نووسینی دکتۆر نیل (A.S.NEIL)
وەرگێڕانی لە فارسی یەوە: قادر وریا

# پەروەردەکردنی
# منداڵانی ئازاد و سەربەخۆ

( بەرگی یەکەم )

نووسینی دوکتور نیل (A.S.NEIL)
وەرگێڕان لە فارسی یەوە   قادر وریا

- پەروەردە كردنی منداڵانی ئازاد و سەربەخۆ.
- نووسینی ( دكتۆر نیل )
- وەرگێڕانی لە فارسیەوە ( قادر وریا )
- بەرگی یەكەم
- چاپی یەكەم / سلێمانی /٢٠٠٠
- تیراژ : ٥٠٠
- لە سەر ئەركی مەڵبەندی ڕۆشنبیری هیوا بە چاپ گەیەنراوە
- ژمارەی سپاردنی ( ١٧٥ )ی ساڵی ( ٢٠٠٠ )ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ دراوە

## بەرایی......

منالانی کورد، ئەو منالە بێنازو پشت گوێخراوانەن کە خۆرسکانە پەروەردە دەبن و نامۆن بەرامبەر پەروەردە کردنێکی تەندروست و زانستیانە، مال و قوتابخانە کە هەردوو تەواوکەری یەکترین، منال پەروەردە ناکەن بەو مانایەی کەسێتیەکی تەواو بە توانا پێشکەش بە کۆمەلگە بکەن، بەلکو هەردەم ترساندن و سەرکوت کردن و چاو شکاندن، لەشیرە خۆرەیی‌یەوە تا مێر منالی و بگرە تاگەورە بوونیش لە گەلیدا دەژی و بووەتە نەریتێك کە هەموو پیادەی دەکەن گەورەکان هەمان میکانیزمی هەلە دوپات دەکەنەوە، کە دوێنێش خۆیانی پێ پەروەردە کراون، کەسێتی لای ئێمە کەسێتی‌یەکی ناتەواو دوو دل و راراو نەخۆشە.

ئیرادە لای ئێمە تا رادەی نەبوون وونە، هەر لە منالی یەوە ووشەی مەکە، بقە، گوناح، قەدەغە، گوێکانمان پر دەکات لە هەموو شتێ دەسلەمینەوە، بەردەوام ووشە کلۆم دروۆ رەهاکان دووپات دەبنەوەو سنورێکی دیاری کراو بۆ بیرکردنەوەمان دادەنێ.

هەر بۆیە چاپ کردنی کتێبی (پەروەردە کردنی مندالانی ئازادو سەربەخۆ) کە لە لایەن دکتۆر نیل وە نوسراوەو لەلایەن برای بەرێز کاك قادر وریاوە لە فارسی‌یەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی کارێکی چاك و دەست پێشخەرانەیە، چونکە ئەم کتێبە گەورەکان زیاتر کەلکی لێ وەر دەگرن بۆ ئەوەی ئەو بۆچوونە چەوت و بەستوانەیان تۆزێ درز پێ بەرێ و بۆچوونی نوێ بێتە ناو بیرکردنەوەیان بۆ پەروەردەکردن و راهێنانی منالان بە شێوەیەك کە دوربێ لەچاو ترساندن و لێدان و سەرکوت کردن.

نامەوێ لێرەدا نێوەرۆکی کتێبەکە بخەمە بەر باس، هێندەی دەمەوێ دەست خۆشی لە چاپ دانی ئەم کتێبە لە (مەلبەندی رۆشنبیری هیوا) بکەم، کە بەو پەری گەرمی‌یەوە باوەشیان کردەوە بۆ لە چاپ دانی، بەم کارەش خزمەتێکی گەورەیان پێشکەش بە کتێبخانە هەژارەکەی کوردی کرد، هیوای سەرکەوتن بۆ کارە خزمەت گوزاری و رۆشنبیریەکانیان دەخوازم و جێگای رێز و ستایشن.

**شۆرش محمد**

## پێشەکیی وەرگێڕ:

کتێبی «پەروەردە کردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ» کە ئێستا لەبەردەستی خوێنەران دایە، نزیکەی چوار ساڵ لەوە پێش بە هۆی نووسەری ئەم دێڕانەوە لە فارسی‌یەوە کراوە بە کوردی.

نووسەری ئەم کتێبە دوکتور نیل (A.S. NEIL) ڕاهێنەرو دەروونناسێکی بەناوبانگی ئینگلیسی‌یە کە دەیان ساڵ لە تەمەنی خۆی بە پەروەردە کردنی منداڵان بردۆتە سەرو لەم مەیدانەدا شارەزایی‌و ئەزموونێکی زۆری هەیە. دوکتور نیل باوەڕی بەوە هەیە کە دەبێ منداڵان لەسەر دوو ئەسڵی ئازادی‌و سەربەخۆیی پەروەردە بکرێن. قوتابخانەی «سومرهیل» کە دوکتور نیل خۆی بەڕێوەبەری بووە، لەسەر بناغەی دوو ئەسڵی ناوبراو قوتابی‌یەکانی پێ گەیاندوون. لەم کتێبەدا خوێنەر لەگەڵ ئەزموونەکانی دوکتور نیل لە بواری پەروەردە کردنی منداڵاندا ئاشنا دەبێ‌و سەرنجی بۆ لای کۆمەڵێک بۆچوون ڕادەکێشرێ کە بە تەواوی نوێ‌و شۆڕشگێڕانەن.

خۆشەویستی‌و ئۆگریم بە منداڵان، بەتایبەتی منداڵانی بێ‌بەشی گەلەکەم لە لایەک‌و لە لایەکی دیکەوە بۆچوونە نوێ‌یەکانی نووسەری کتێبی «پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ» . کە بایەخێکی تایبەتی بە سروشت‌و خووو خدەو مافەکانی منداڵان دەدەن . هانیان دام هەر لەگەڵ لێبوونەوە لە خوێندنەوەی وەرگێڕاوە فارسی‌یەکەی، بڕیاری خۆم بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی کوردی بدەم‌و لە ماوەی ٦ مانگی یەکەمی ساڵی ١٩٩٤ دا بەجێی بگەیەنم.

منداڵانی کوردستان بەداخەوە هەر لە سەرێکەوە لەگەڵ بێ‌بەشی‌و بێ ئەنوایی بەرەوروو نین. ئەوان منداڵانی گەلێکی ژێردەستن‌و گەلەکەیان لە دواساڵەکانی سەدەی بیستەمدا، هەروا لە مافی بەدەستەوە گرتنی چارەنووسی خۆی بێ‌بەشە. ئاشکرایە کە گەلێکی بندەست ناتوانێ سەدی یەکی ئەو خزمەت‌و هەوڵانە ئەنجام بدا کە بۆ پێگەیاندن‌و بەختیاریی منداڵانی پێویستن.

ئەگەر منداڵانی گەلانی ئازادو پێگەیشتوو، لە نێو نازو نیعمەت‌دا چاو هەڵ دێنن‌و لەو هەموو ئیمکاناتە جۆراوجۆرە کە بۆ پەروەردە کرانی جیسمی‌و روحی‌و فیکری‌یان پێک هاتوە، کەڵک وەردەگرن، منداڵانی کوردستان هەر لە رۆژی یەکەمی ژیانیانەوە، لەگەڵ ئەو تاڵی‌و ئازارو مەینەت‌و کارەساتانە بەرەوروو دەبن کە بەداخەوە بوون بە بەشێکی جوێ نەکراوە لە ژیانی تانێستای نەتەوەکەیان.

دەربەدەری‌و ئاوارەیی، کاول کرانی ماڵ‌و هێلانە بە هۆی ئاگرو ئاسن‌باراندنی دوژمنانی گەلی کوردەوە، بێ‌بەش بوون لە خوێندن بە زمانی زگماکی لە سێ بەش لە چوار بەشی کوردستان‌دا، بێ‌بەشی لە خوێندن‌و قوتابخانەو، تێپەر کردنی ژیانی منداڵی بە شوانی، گاوانی، دەستفرۆشی، کەوش بۆیاغ کردن‌و شاگردی‌و بەردەستکاری، کرێکاری‌و ...، هەبوونی مەراق‌و حەسرەت‌و تاسەو خۆزگەی ژیانێکی ئاسوودەو دوور لە ستەم‌و چەوسانەوە، لەو دیاردانەن کە بەشێکی یەکجار زۆر لە منداڵانی کوردستان بە ئێسک‌و پێستیانەوە چێشتوویانن‌و هەستیان پێ کردوون.

بۆ ئەوەی منداڵانی کوردستانیش چی دیکە لەم وەزعەدا نەمێننەوەو هەل‌و مەرجێکی باشتر بۆ ژیان‌و پەروەردە بوونیان پێک بێ، پێویستە شان بە شانی ئەو خەباتە کە بۆ گەیاندنی گەلەکەمان بە ئازادی‌و مافە نەتەوایەتی‌یەکانی بەرەوپێشی دەبەین، لە هەوڵی دەوڵەمەند کردن‌و بەرەوژوور بردنی زانست‌و ئەزموون‌و تێگەیشتنی گەلەکەمان لە بواری پەروەردە کردنی منداڵان دابین. کتێبخانەی کوردی لەو بارەوە نەک هەر دەوڵەمەند نیە، زۆریش دەسکورتە. ژمارەی ئەو کتێبانەی بە زمانی کوردی لە تیئۆریی پەروەردە کردنی منداڵ دەدوێن، لە ژمارەی قامکەکانی دەست تێ‌ناپەڕن.

وەرگێڕانی کتێبی «پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ» هەنگاوێکی بچووکە لە پێناوی پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنە گەورەیەدا کە بەدی دەکرێ. هەر لەو کاتەش‌دا هەوڵێکە بۆ برەو پێدانی دوو ئەسلی گرنگی ئازادی‌و سەربەخۆیی لە پەروەردە کردنی منداڵانی کوردستان‌دا کە بە داخەوە زۆربەیان لە ماڵەوەو لە کۆمەڵ‌دا بەسەرکوت راهێنراون.

ئەم کتێبە لە ئەسڵدا بە ئینگلیسی نووسراوەو ئاغای «عبدالرضا صرافان» لە ژێر ناوی «کودکانی مستقل و آزاد تربیت کنیم» کردوویە بە فارسی. لە فەسڵی کۆتایی دەقە فارسی‌یەکەدا بیرورا‌و بۆچوونی کۆمەڵێک لە شارەزایانی پەروەردەکردن‌و مامۆستایانی زانستگە بە ناوبانگەکانی رۆژئاوا لە بارەی بۆچوونەکانی دوکتور نیل بەرچاو دەکەون کە بەشێکیان بە لایەنگری‌و هێندێکیشیان بە دژایەتی لەگەڵ روانگەو بیرورای ئەو نووسراون. بەداخەوە من لەبەر بێ‌هیوایی لە ئیمکانی چاپی کتێبێکی ئاوا گەورە، لە وەرگێڕانی دوو فەسڵی کۆتایی ئەم کتێبە خۆم پاراست. دیارە ئەگەر رۆژێک ئەوهۆمێدەم هەبێ، قسەی تێدانیەکە ئەوبەشەش دەکەم بە کوردی.

لە کۆتایی ئەم پێشەکی‌یەدا جێی خۆیەتی لە قووڵایی دڵمەوە سوپاس‌و پێزانینی خۆم بەرامبەر بەو بەڕێزانە دەربڕم:

ـ دۆستی دێرین‌و برای شیرینم کاک عبدالله فتاحی کە کتێبەکەی پێ‌ناساندم‌و پێی بەخشیم تا بیکەم بە کوردی.

ـ مامۆستای خەبات‌و نووسینم مامۆستا عبدالله حسن‌زادە کە سەرەرای هەموو سەرقاڵی‌و کاری زۆری رۆژانەی، بە وردی بە وەرگێڕانەکە دا چۆوەو لە تێبینی‌یە وردو جوانەکانی، بێ‌بەشی نەکردم.

هاوڕێ وهاوکاری کارجوانم خوشکە جەمیلەی قادری کە زەحمەتی تایپ کردنی ئەم کتێبەی گرتە ئەستۆو زۆری پێوە ماندوو بوو.

ـ کاک کامران حداد کە مۆنتاژی کتێبەکەی بۆ ئەنجام دام.

قادر وریا

خەرمانانی ١٣٧٦

سێپتامبری ١٩٩٧

## پێشەکیی نووسەر:

زانســتی دەروونناسی هەتا ئێســتــاش پێشکەوتنێکی زۆری وەدەست نەهێناوە، دەسەڵاتی ئەو هێزە دەروونی (رەوانی)یانەی جموجۆڵ و کردەوەکانی ئینسان کونترۆڵ دەکەن هێشتا بۆ ئێمە نەناسراوە.

لەوکاتەوە کە فرۆید بناغەی زانستی دەروونناسیی دارشت تا ئەمڕۆ، زۆر ئەزمــوون لەو ڕێیەدا دەست کــەوتوون بەڵام ئەو ئەزمــوونانە تەنیـا قــەراغ و لێوارەکانی ئەم مەیدانە نوێیە (زانستی دەروون ناسی)ی دۆزیوەتەوە. لەوانەیە پەنجا ساڵی دیکە بەرەی داهاتوو کە زۆر مەسەلەی تازەیان لە دەروونناسیدا بۆ دەردەکەوێ پێکەنینیان بە نەزانیی ئەمڕۆی ئێمە بێ.

لەو کـاتەوە کـە من ژیانی خۆم بۆ دەروونـناسـیی منداڵ تەرخـان کـردوە، پێوەندیم بە گـەلێـک منداڵەوە هەبوە کـە لە ئاڵۆزیی دەروونیی جـۆربەجـۆری وەک: شــێـتــیی ئاورکــردنەوە، دزی، درۆزنی و بێ‌خــەوی زەبریان چێشــتــوە. ســاڵانێکی زۆر کــاری بەردەوام و ئەزمــوون وەســەریـەک نان لەو بوارەدا بەو باوەرەی گەیاندووم کە زانیاریی‌یەکی کەمان لە بارەی ئەو هێزە دەروونی‌یانەوە هەیە کە ڕێنوێنی ژیانی ئێمەن.

من لـەسـەر ئەو بـاوەڕەم کـە بنەمـاڵە و کـۆمـەڵ لە تێک‌دانی تەعــادولی منداڵدا نـەخـشـێکی گـرنگـیـان هەیە. مـنداڵی «ناتەواو» ئەو منداڵەیە کـە لە ژیان‌دا هەست بە شادی و رەزامەندی ناکا و هەربۆیە لەگەڵ خۆی و کەسانی دەوروبەری دەکەوێتە بەربەرەکانی.

ئەو کــەســانەش کــە تەمــەنێکیــان لێ رابردوە و «ناتەواو»ن هەر ئەو گیروگرفـتەیان هەیە. پیاوێکی بەخـتـیـار هەرگـیزاوهەرگـیز حەز لە ئازار و ئەزیەتی کەسانی دیکە ناکا، پشـتیوانیی لەشەڕ و خوێنڕێژی ناکا و بە چاوی

سووکەوە نارروانێتە ڕەگەزی ڕەش پێستەکان. ژنێکی بەختیار قەت مێرد و منداڵی خۆی ئازار نادا. ئینسانێکی رازی و بەختەوەر هیچ کات پەنا ناباتە بەر دزی و جینایەت. سەرۆکێکی بەختیار هەرگیز ژێردەستەکانی چاوترسێنە ناکا.

هەموو جینایەت و شەڕ و بێزارییەک لە نەخۆشیی دەروونییەوە سەرچاوە دەگرن. من هەوڵ دەدەم لەم کتێبەدا نیشانی بدەم کە ئەو نەخۆشییە دەروونییە چۆن ریشە دادەکوتێ و ژیانی ئینسانەکان لەگەڵ مەترسیی لەنێوچوون ڕووبەڕوو دەکا و چۆن دەکرێ بە پەروەردە کردنی دروست پێشی ریشە داکوتانی بگیرێ.

ئا. ئێس. نیل A.S. NEIL

# فەسڵی یەکەم:

## سومرهیل

* ناسینی قوتابخانەی «سومرهیل»
* بەراوردێک لە نێوان پەروەردە و فێرکردن لە قوتابخانەی ئازادو قوتابخانە سوننەتی‌یەکان‌دا
* منداڵان تا چ رادەیەک کار کردنیان پێ خۆشە؟
* کایە (یاری)
* یاری‌یە شانۆیی‌یەکان
* موسیقا و هەڵپەرکێ
* وەرزش و یاریی بە کۆمەڵ
* داهاتووی قوتابخانەی سومرهیل.

## ناسینی قوتابخانەی «سومرهیل»

قوتابخانەی «سومرهیل» لە سەرانسەری دنیادا وەک قوتابخانەیەکی نوێ و خاوەن بیروڕای شۆڕشگێڕانە ناسراوە. ئەو بیروڕایانە کە بە هۆی ئاغای دوکتور «نیل» بەرپرس و بەڕێوەبەری قوتابخانەوە لە کتێبە جۆربەجۆرەکان و چەندین کونفرانس‌دا شی کراونەوە، لە قوتابخانەی «سومرهیل»دا بەڕێوە دەچن. قوتابی‌یەکانی ئەو قوتابخانەیە شەو و ڕۆژ لە قوتابخانەدا دەژین و خەرج و بەڕێچوونیشیان لەسەر دایک و باپیانە.

ئەسڵی بنەڕەتیی ئەو قوتابخانەیە لەسەر بناغەی ئازادیی قوتابیان دامەزراوە. دیارە ئەو ئازادی‌یە بێ سنوور نیە و بە مەبەستی دابین بوونی ئەمنییەت و سەلامەتیی قوتابیان ئەو یاساو ڕێ و شوێنانە بەڕێوە دەچن کە منداڵانی قوتابی بۆخۆیان پێشنیاریان کردوە و ڕەزامەندیی بەڕێوەبەری قوتابخانەیان بۆ وەدەست هێناوە. بۆ وێنە منداڵان ئازادن بەتاقی تەنیا بۆ مەلە کردن بچنە ئەستێر و پێویستە لەکاتی مەلەکردنی منداڵاندا دوو مەلەوانی بەئەزموون بۆ پێشگیری لە خنکانیان لە لایان بن. هەروەها منداڵانی چووکتر بێ ئەوەی یەکێکی لە خۆیان گەورەتریان لەگەڵدابێ حەقی چوونە دەر لە قوتابخانەیان نیە. ئەم ڕێ و شوێنانە و یاسای دیکەی لەم چەشنە هەر بە هۆی قوتابی‌یەکانەوە پێشنیار و پەسند دەکرێن و هەر [illegible] ـانخانە زۆر پێ جەریمە دەکرێ. بەوحاڵەش ئەوەندە

ئازادی‌یەی لەو قوتابخانەیەدا دراوە بە منداڵان لە ئازادیی منداڵان لە قوتابخانەکانی دیکەدا زۆر زیاترە. ئەو ڕاپۆرتانەی لەبارەی ئەو قوتابخانەیەوە ئامادە کراون دەری دەخەن کە ئازادی‌یەکە هەر لە قسەدانیە و بە کردەوە هەیە.

وەک نموونە لەو قوتابخانەیەدا هیچ قوتابی‌یەک بە زۆر ناکێشرێتە سەر کلاسی دەرس خوێندن. کەچی زۆربەی قوتابی‌یەکان بەرێک و پێکی لە کلاسەکانی دەرس خوێندن‌دا ئامادە دەبن، تاقە نموونەیەک نەبێ کە قوتابی‌یەک بۆ ماوەی سێزدە ساڵ لە چوون بۆ سەر کلاسی دەرس خۆی بوارد و هیچ کەس زۆری لێ نەکرد بەشداری بکا. هەر ئەو قوتابی‌یە کاتێک بریاری دا بخوێنێ، توانی بە شێوەیەکی زۆر خێرا پێش کەوێ و پاش خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی پێی نایە زانستگە و ئێستاش وەک ئەندازیاری بەرق (کارەبا) خەریکی کارە. ئەم نموونە دەگمەنە لێرەدا بۆیە خرایە بەرچاو تا دەرکەوێ ئەو ئازادی‌یەی دراوە، شتێکی تەواو ڕاستەقینەیە و ئەگەر خوێندنی قوتابی‌یەک ئاکامێکی دڵخوازیشی نەبێ، ئازادی‌یەکەی لێ ناستێندرێتەوە. سەرەڕای هەمووی ئەمانەش لەو قوتابخانەیەدا بیروڕای ئاژاوەخوازانە بەرچاو ناکەوێ. ڕێ و شوێن و یاساکان بە هۆی دەستەیەکی پێک هاتوو لە نوێنەرانی قوتابیان کە سەرۆکەکەش هەر یەکێک لەوانە، پیادە دەکرێن. هەڵسوورێنەرانی قوتابخانە و هەرکام لە قوتابی‌یەکان ئەگەر پێیان خۆش بێ دەتوانن لەو دەستەیەدا بەشدار بن. ئەم دەستەیە لە بواری باس و لێکۆڵینەوە سەبارەت بە گیروگرفتەکانی قوتابخانە و دانانی یاسا لە پێوەندی لەگەڵ ئەوان‌دا ، دەسەڵاتێکی بێ سنووری هەیە.

دوکتور «نیل» بەرپرسی قوتابخانە دەڵێ: من ساڵانێکی زۆر لە قوتابخانە سوننەتی‌یەکان‌دا خەریکی دەرس گوتنەوە بووم. بەڵام چونکە بڕوایەکم بەو جۆرە قوتابخانانە نەبوو، لەگەڵ ژنەکەم کەوتینە هەوڵی

بنیاتنانی قوتابخانەیەک کە لەوێدا دەرەتانی ئازادیی کردەوە و رادەربرین بدرێ بە قوتابیان. بۆ ئەو مەبەستە دەبوایە لەهەر جۆرە سزا دان و رێ و شوێنی ئینزیباتیی لە پێشدا دیاری کراو و ئامۆژگاری‌یەکی بێ سەرەوبەرە خۆ ببوێرین. من بە تەواوی لەسەر ئەو بڕوایەم کە منداڵ هەر لە جێدا باشە و بیروڕای دروستی هەیە و لە ژینگەیەکی ئازاددا، تا ئەو جێگایەی توانا و لێوەشاوەیی‌یە سروشتی‌یەکانی رێگای پێ دەدەن، دەتوانێ بەباشی پەروەردە بێ و گەشە بکا. بە پێی ئەو بۆچوونە لە قوتابخانەی ئێمەدا ئەگەر کەسێک ئیرادە و لێوەشاوەیی پێویستی بۆ بوون بە زانا تێدابێ، دەتوانێ ببێ بە عالم و زانا و ئەگەر لەو توانایەش بێبەش بێ لەوانەیە ببێ بە خۆڵماڵ (کنّاس). بەڵام تا ئێستا هیچ کام لە قوتابی‌یەکان دوای تەواوکردنی خوێندن لە قوتابخانەکەمان نەبوون بە خۆڵماڵ. دیارە من نامەوێ شانازی بەو مەسەلەیەوە بکەم چونکە لە روانگەی منەوە خۆڵماڵێکی بەختیار زۆر لە زانایەکی «ناتەواو» کە نەخۆشیی دەروونیی هەیە، باشترە.

لە قوتابخانەکەی ئێمە بەشداریی لە کلاسەکانی دەرسدا شتێکی تەواو دڵخوازانەیە و قوتابی‌یەکان بە ویستی خۆیان دەرسەکان هەڵ دەبژێرن. لە روانگەی منەوە شێوەکانی دەرس گوتن ئەوەندە گرنگ نیە، شتێک کە لە بواری فێرکردندا گرنگە ئۆگری و تامەزرۆیی‌یە کە بەتەواوی رێ خۆشکەری فێربوونە. بۆ وێنە ئەگەر قوتابی‌یەک بیهەوێ لە زانستی ئەژمێردا فێری دابەشکردن (تقسیم).و کەم کردنەوە (تفریق) بێ، لەهەر رێگایەکەوە بووە فێری دەبێ و شێوە جۆربەجۆرەکانی فێرکردن نەخشێکی زۆر گرنگیان لەو کارەدانیە.

لە روانگەی من و مامۆستایانی قوتابخانەکەمانەوە، تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵی خوێندن کارێکی تەواو بێ بایەخ و بێ کەلکن. هەربۆیە لە قوتابخانەی ئێمەدا شتێکمان بە ناوی تاقیکردنەوەی

کۆتایی ساڵ نییە. بەڵام ئەو قوتابییانەی بیانەوێ لە زانستگەکاندا درێژە بە خوێندن بدەن، هەرکە تەمەنیان دەگاتە چاردەساڵی بەشی زۆری کاتی خۆیان بۆ دەرس خوێندن تەرخان دەکەن تا بتوانن لە تاقیکردنەوەکاندا سەرکەون.

لە قوتابخانەی ئێمەدا قوتابیان و هەڵسووڕێنەران لەگەڵ یەکتر بەرامبەرن و هەرکامێکمان یەک مافی دەنگدانمان هەیە. دیارە ئەگەر مەسەلەیەکی گرنگی وەک ئاگر گرتنی خانووبەرەی قوتابخانە رووبدا، من بەرپرسم. بەڵام ئەگەر من لە منداڵەکان داوا بکەم کە لە کاتی کار کردندا رێی دەستم نەگرن، ئەوانیش لە کاتی یاری کردن دا زۆر بە هاسانی دەتوانن لە منیان بوێ لێیان دوور کەومەوە. یان کاتێک من لەوانم دەوێ دەست لە «پیانۆ»یە کەم وەرنەدەن، ئەو مافەش بە خۆم نادەم کە بێ پرسی وان کەڵک لە دووچەرخەکانیان وەربگرم.

گرنگترین مەسەلەی قوتابخانەکەمان نەبوونی ترسە. منداڵێکی ٩ ساڵە کاتێک شووشەی پەنجەرەیەک دەشکێنێ زۆر بەهاسانی دێتە لام و رادەگەیەنێ کە شووشەکە، ئەو لەکاتی تۆپ تۆپێندا شکاندوویە. ئەو بۆیە دێ مەسەلەکەم لەگەڵ باس دەکا چونکە لێم ناترسێ و دەزانێ دەرهەڵ نابم. ئەو دەزانێ کە ناچارە پووڵی شووشەکە بژێرێتەوە بەڵام ئیدی شتێک بە ناوی ترس و سزا و سەرکۆنە لە گۆڕێ دانیە.

کاری منداڵ ئەوەیە ژیانی تایبەتیی خۆی بەرێوە بەرێ نەک ئەو شتە کە دایک و باب و راهێنەرەکانی بۆی دادەنێن و پێی دەسپێرن. ئەگەر منداڵێک بە پێچەوانەی ویستی خۆی ناچار بە فێربوونی موسیقا و یان هەرشتێکی دیکە بکەین، ئەومان وەک ئینسانێکی بێ ئیرادە راهێناوە. ئەو کەسەی هەموو شتێک هەروەک خۆی و بێ بیرلێ کردنەوە قبوول دەکا، نابێ چاوەڕوانیی هیچ چەشنە داهێنانێکمان لێ هەبێ.

## بەراوردێک لە نێوان پەروەردە و فێرکردن لە قوتابخانەی ئازادو قوتابخانە سوننەتی یەکاندا

ئامانجمان لە پەروەردە و فێرکردن دەبێ ئامادە کردنی منداڵان بۆ ژیان بێ. بۆ ئەو مەبەستە پێویستە سەرنج و ئۆگریی وان بۆلای مەبەست یان بابەتێکی تایبەتی راکێشین. لەوبوارەدا فەرهەنگ سەرکەوتوو نەبووە. پەروەردە و فێرکردنی ئەمڕۆ و سیاسەت و ئابووریی حاکم بەسەر جیهاندا، ئێمە بەرەو شەڕ رادەکێشن.

زانستی پزیشکی نەیتوانیوە کۆتایی بە نەخۆشی بێنێ. هەرچەند ئیددیعای ئاژەڵ دۆستی دەکەین هێشتا کردەوەی وەحشیانەی راوی گیانلەبەران وەک جۆرێک وەرزش چاو لێ دەکەین. ئەو ئیددیعایانەی لەبارەی پێشکەوتنەکانی ئەمڕۆوە دێنە گۆڕێ تەنیا لە بواری تیکنولۆژی بۆ وێنە میکانیک، ئەلکترونیک، کامپیوترو ... دان.

ئەگەر دەمانەوێ باشتر لەو فەرهەنگەی بەسەر جیهاندا زاڵە ورد بینەوە خراپ نیە بەر لە هەر شتێک چەند پرسیارێک لە خۆمان بکەین. بۆچی مرۆڤ زیاتر لە گیانلەبەرانی دیکە تووشی نەخۆشی دەبێ؟ بۆچی ئینسان خۆی و ئینسانەکانی دیکە لە شەڕە بێ ئاکامەکاندا لەنێو دەبا؟ لە حاڵێکدا گیانلەبەرانی دیکە ئەوەی ناکەن! بۆچی خۆکوشتن تا ئەو رادەیە پەرەی ستاندوە؟ بۆچی جینایەتە جینسی یەکان رۆژ دوای رۆژ زیاتر دەبن؟ بۆچی رەگەزپەرستی تا ئێستاش هەرماوە؟ هۆی چیە لە هێندێک لە وڵاتاندا رق و بێزاری لە رەش پێستەکان هەر بەردەوامە؟ و هەزاران پرسیاری دیکە لە بارەی شارستانەتی یەکەوە کە خۆی بەسەرکەوتوو و بە شکۆ دەزانێ!

ئەو پرسیارانە بۆیە دێنمە گۆڕێ کە وەک دەروونناس و راهێنەرێکی پەروەردەیی پیشەکەم وا دەخوازێ. هەروەها لەوەشەوە سەرچاوە دەگرێ کە

ئەو پرسیارانەی راهێنەرەکانی دیکە دەیان هێننە گۆڕێ زۆرتر شێوەی ئاکادیمیک و رەسمی‌یان هەیە. ئەوان لەبارەی فێربوونی مێژوو، زمان، ئەژمێر و خوادەزانێ چ دەرسێکی دیکەش چەندین سەعات قسە و باس دەکەن، لە حالێکدا بە بڕوای من ئەم جۆرە باسانە لەچاو رەوتی سروشتیی ژیان و پشکوتنی هەستی ئینسانی بایەخێکی ئەوتۆیان نیە.

دایک و باوک لە مالێدا بەردەوام هەولْ دەدەن شت فێری منداڵەکەیان بکەن. کاتێک منداڵ دەیەوێ ئەو شەمەندەفەرە بەرقی‌یەی بە دیاری داویانەتێ وەکار بخا، دەست بەجێ یەکێک دەست وەپێش دەخا و چۆنیەتیی کارکردنەکەی فێردەکا. ئەو کاتەی دەیەوێ دەست بۆ شتێک بەرێ، دەست بەجێ پێشی پێ دەگرن. دەبێ بزانین هەرجارێک کە بێ ئەوەی منداڵ داوا بکا چۆنیەتیی کارکردنی ئامرازێکی پێ دەلێین و رێگای ئەوەی لێ دەگرین بۆخۆی فێری بێ، لەراستی‌دا خۆشیی ژیان، خۆشیی دۆزینەوە و هەلْنان و خۆشیی سەرکەوتن بەسەر کۆسپەکانی دا لێ زەوت دەکەین و ئەو هەستەی تێدا پێک دێنین کە ئەو بوونەوەرێکی لاوازە و بوونی وی بەندە بە یارمەتیی کەسانی دیکە.

دایک و باب بە هاسانی قبوولْ ناکەن کە فێر بوون لە قوتابخانەدا بایەخێکی ئەوتۆی نیە. منداڵانیش وەک گەوران ئەو شتانە فێر دەبن کە دەیانەوێ فێریان بن. ئەگینا هەموو ئەو خەلاّت بەخشین و نومرە پێ نەدان و تاقیکردنەوانە تەنیا دەبنە هۆی بەلاڕێ داچوونی هەلْدانی سروشتیی شەخسییەتی منداڵان. زۆربەی ئەو دەرسانەی قوتابیان دەبێ لە نێو پۆلدا فێریان بن، بێجگە لە بەفیڕۆ دانی کات و ئینێرژی ئاکامێکیان نیە. بەم کارە مافی یاری کردن و تێپەرکردنی کات بە کایە و یاریمان لە منداڵان زەوت کردوە و فکر و بۆچوونی ئینسانە گەراوە و بەسالْ داچووەکانمان بردۆتە نێو مێشکی لاوەکان. ئەو شتەی منداڵان پێویستیانە بریتی‌یە لە: خوێندنەوە، نووسین و حیسێب کردن. لە پاشان دەبێ هەوری پەیکەر

سازی، کەل و پەل و پێویستییەکانی کاری دەستی، وەرزش، تیئاتر، نیگارکێشی و ئازادی بدرێتە منداڵان بۆ ئەوەی پەروەردە بن. لەو کۆنفرانسانەدا کە لە لایەن خوێندنگە بەرزەکان و زانستگەکان بە مەبەستی وتاردان بانگهێشتن دەکرێم، زۆر وەخت لە کاڵی و ناپوختەبوونی ئەو کچ و کوڕە گەنجانە کە مێشکیان لە زانیاریی بێ سوود و بێ خێر ئاخنراوە، تووشی سەرسووڕمان دەبم. ئەوان بەراستی زۆر شتان دەزانن. لە بارەی «منطق» ەوە بە ڕەوانی دەدوێن. ئەدەبیاتی کۆن باش دەزانن، بەڵام لە بارەی دوورە دیمەنی ژیانی خۆیانەوە، زۆریان روانینێکی منداڵانەیان هەیە. هەمووی ئەوانە لەبەر ئەوەیە کە فێریان کردوون چۆن زانیارییەکان فێر بن. بەڵام فێریان نەکردوون کە چۆن هەست بە مەسەلەکان بکەن. کەمایەسیی ئەو لاوانە کە زۆریش خۆشەویست و لەبەردڵانن بریتییە لە: بێبەشی لە هۆکارە گوڕ و تین خوڵقێنەکان و دەستەوەستانی لە موتوربە کردنی بیروهەستدا. کتێبە دەرسییەکانیان هێندێ مەسەلەی وەک: خوو و خدەی ئینسانی، ئەوین و خۆشەویستی، ئازادی و بۆخۆ بڕیاردانیان بۆ شی ناکەنەوە و نیزامی ئامووزشی نموونەی خۆی لەو کتێبانەدا دەدۆزێتەوە کە مێشک و دڵ، یان بیرو هەست لێک جوێ دەکەنەوە.

ڕەنگە ئێستا کاتی ئەوە هاتبێ کە چاو بە واتای کار و فێر بوون (بەو جۆرەی لە قوتابخانەکانی ئەمڕۆدا باوە) دا بخشێنینەوە. ئەمڕۆ فێربوونی ماتماتیک (ریاضیات)، مێژوو، جوغرافیا، زانستەکان، هونەر و ئەدەبیات لە لایەن منداڵانەوە وەک فیکرێکی لەقالب دراوی لێ هاتوە. ئێستا ڕۆژی ئەوە هاتوە کە تێ بگەین نیوەی قوتابیان ئەو بابەتە دەرسییانەیان پێ خۆش نیە.

من نامەوێ لێرەدا فێربوون و خوێندنەوە وەک شتێکی بێ بایەخ دابنێم. بەڵام بە بۆچوونی من دەبێ لە پێوەندی لەگەڵ منداڵاندا، لە پلەی

یەکەمدا گرینگی بدرێ بە یاری کردن دوایە فێر بوون و خوێندن. دەرس خوێندن شتێکی زۆر گرنگە بەلاّم نەک بۆ هەمووان. نیژینسکی Niginsky (بالرین) بالەزانی ناوبەدەرەوەی شووروەوی نەی‌توانی لە تاقیکاریی وەرگیران لە مەدرەسەی میللیی بالەی شوورەوی‌دا سەرکەوێ. ناوبراو لە قوتابخانەدا نەی‌دەتوانی بخوێنێ چونکە هەموو هۆش و بیری لە جێ‌یەکی دیکە بوو و دەیویست ببێ بە «بالرین» (بالەزان). سەرەنجام قوتابخانەی بالە تاقیکاری‌یەکی رواڵەتیی بۆ پێک هێنا و پرسیار و وەڵامەکانی نایە بەردەست تا بەم جۆرە بتوانێ پێ بنێتە قوتابخانەی بالە. بیری لێ بکەنەوە ئەگەر قوتابخانەی بالە نیژینسکیی لەگەڵ تاقیکاری‌یەکی جیددی بەرەوروو کردبایە، ناوبراو رێی نەدەکەوتە ئەوێ و جیهان هونەرمەندێکی ئاوا گەورەی لەدەست دەچوو.

هونەرمەندان و داهێنەران لە هەر رێگایەکەوە بێ فێری ئەو شتە دەبن کە بەدوای‌دا دەگەڕێن. چونکە هێزی دەروونی و بلیمەتیی ئەوان وا دەخوازێ کە ئامرازی پێویست وەدەست بێنن. ئێمە بە هاسانی ناتوانین تێ‌بگەین کە لە پۆلەکانی خوێندن‌دا بەوە کە قوتابی‌یەکان ناچار دەکەین ئەو دەرسانە فێر بن کە حەزیان لێ ناکەن، چ هێزێکی داهێنەر لە نێو دەبەین.

ماوەیەک لەمەوبەر دایکێک سکالاّی خۆی لە کچەکەی هێنایە لای من و گوتی کچەکەی هەموو شەوێ بەدەست دەرسی جوغرافیاوە دەکەوێتە شیوەن و گریان. ئەو دایکە دەیەویست کچەکەی بۆ درێژەی خوێندن بچێتە زانکۆی علوم. بەلاّم کچەکە زیاتر سەری لە هونەر دەخورا و پێی خۆش بوو لە لقی تیئاتر (شانۆ)دا درێژە بە خوێندن بدا. ئەو کچە حەوت جاران لە تاقیکردنەوەی وەرگیران لە زانکۆی علوم‌دا بەشدار ببوو، هەر حەوت جار رەت ببۆوە. سەرەنجام دایکەکەی گەیشتە ئەو قەناعەتە کە باشترە لە کچەکەی گەڕێ و رێگای بدا لە لقی دڵخوازی خۆی‌دا خوێندن

دریژە بدا.

کاتێک ئەو هەمـوو خوێندکـارە بێ مـەیلە دەبینم کـە دوای تەواو کردنی خوێندنی لقێکی نابەدڵ، دەبن بە فـێرکار و مـامـۆستـایەکی مامناوەندی، یان دوکتورێکی خراپ، یان حوقووقزانێکی لێ نەهاتوو، لە دڵی خـۆمدا دەڵێم ئەگـەر ئەوانە لە هەڵبـژاردنی لقـەکـانی خـوێندندا سەربەست بوایەن لەوانە بوو ببانە وەستایەکی باشی شت چاک کردنەوە، سەروەستایەکی کارجوان و ژاندرمەیەکی ئەرکناس.

لە قـوتـابخـانە بە تەجرەبە بۆمـان دەرکـەوتوە ئەگەر کورێک نەیەوێ بەرلە پازدە سـاڵی فـێری خوێندنەوە و نووسین بێ، زیاتر مەیلی بەلای مەسەلە فەننی‌یەکان دایە و سەرەنجام دەبێتە ئەندازیار یان تەکنیسیەنێکی کارامە. ئەو کـچانـەش کە بۆ وێنە مـاتماتیک و فیزیک کەمتر سەرنجیان رادەکێشێ و دڵیان بە بەرگدروون و کێشانی نەخشەی جل و بەرگەوەیە، زۆر جار بەرگدروو و نەخشەکێشی کارجوانیان لێ هەڵ دەکەوێ.

قـوتـابخـانـە لە هەمـوو وڵاتانی جـیـهـان چ سـەرمـایەداری ، چ سوسیالیست یان کومونیست بۆ فـێرکردنی لاوان دروست کراوە. بەڵام باشترین پۆلەکـان و چاکترین کەل و پەل و ئامرازی نێو تاقیگەکان (لابراتوار) لە قـوتـابخـانەکاندا ناتوانن ئەو گـیروگـرفـتـە عـاطفی و کۆمەڵایەتی‌یانە کە منداڵان لە ئاکامی فشاری ناپێویستی مامۆستایان، دایک و بابەکـان و کۆمەڵدا بە مەبەستی فـێربوونی دەرسەکان تووشیان دەبن چارەسەر بکەن و لە نێویان بەرن.

## منداڵان چەندە حەز لە کار کردن دەکەن؟

چەندین ساڵ لەمەوبەر لە قوتابخانە قانوونێکمان هەبوو کە حوکمی دەکرد قـوتابیـان و مـامـۆستـایانی قـوتابخانە لە حەوتوودا لانی‌کەم ٢ سەعـات کـاتی خۆیان بۆ هێندێک کـاری وەک باخەوانی و چاکردنەوەی

دەرگا و پەنجەرە و ... تەرخان بکەن. بۆ ئەنجام دانی ئەو جۆرە کارانە هەقدەستێکی سەمبولیکمان (بۆوێنە پێنج قران بۆ سەعاتێک) دیاری کردبوو کە بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو. بەلاّم ئەگەر یەکێک لە ئەنجام دانی ئەو جۆرە کارانە خۆی بواردبا ناچار دەکرا دوو بەرامبەری ئەو رادەیە جەریمە بدا. زۆربەی مامۆستایان و قوتابیان کە نەیان دەویست ئەو جۆرە کارانە بکەن، جەریمەکەیان دەدا و خۆیان لەو جۆرە کارانە دەرداویشت. ژمارەیەک لە قوتابییەکان کە ناچار دەبوون کارەکە بکەن بەردەوام دەیان روانیە سەعات تا بزانن کەنگێ ئەو دوو سەعات بێگارە تەواو دەبێ. ماوەیەک دواتر لە کۆبوونەوەیەکی گشتیی قوتابخانەدا، یەکێک لە قوتابییەکان نارەزایی خۆی لە قانوونی کاری زۆرەملێ دەربڕی و داوای کرد کە سەرلەنوێ دەنگی بۆ وەربگیرێ. پاش دەنگ وەرگرتن بۆمان دەرکەوت کە هەموو قوتابیان خوازیاری هەڵوەشانەوەی ئەو قانوونەن بۆیە کاری ئیجباری لە قوتابخانە هەڵگیرا.

چەند ساڵ لەوە پێش دەمانەویست لە قوتابخانەکەماندا ژوورێکی بچکۆلە بۆ کاری دەرمانی دروست بکەین. لەبەر ئەوەی پووڵی پێویستمان بۆ دروست کردنی نەبوو لەگەڵ قوتابیان و هەڵسووڕێنەرانی قوتابخانە بەیەکەوە بریارمان دا دیوارە لە مێژینەکانی قوتابخانە برووخێنین و بەکەڵک وەرگرتن لە خشتەکانی ئەو دیوارانە و بە هاوکاریی یەکتر ژووری کاری دەرمانی ساز بکەین. هێندێک لە منداڵان لە رووخاندنی دیوارە کۆنەکان و دانەوەی بناغەی دیواری ژوورەکەدا یارمەتییان داین بەلاّم لە بەرامبەردا داوای هەقدەستیان لێ کردین. چونکە پووڵێکیشمان بۆ دانی هەقدەست لە دەست دانەبوو، منداڵەکان زۆر زوو لە هاوکاری کردنمان خۆیان بوارد.

سەرەنجام ژووری کاری دەرمانی بە هێزی مامۆستاکان و ژمارەیەک لە دایک و باوکەکانەوە دروست بوو. ئەو جۆرە کارە منداڵەکانی

دادەهێزاند و ئەوان هەستیان بە قازانجەکەی نەدەکرد. بەڵام ماوەیەک دواتر کە ویستمان دیوێکی چووکە بۆ دووچەرخەکانیان دروست بکەین تێکڕا بەوپەڕی خوشحالی‌یەوە و بێ یارمەتیی ئێمە بە تەنیایی دروستیان کرد. لای منداڵان هەستی هاوکاری کردن و یەکتر یارمەتی دان، بەو شێوەیە کە لە گەورەکاندا هەیە ـ هەست کردن بە بەرپرسایەتیی کۆمەڵایەتی ـ تەنیا لە دوای تەمەنی هەژدە ساڵی پێک دێ. منداڵان زیاتر چاویان لەپێویستی‌یەکانی ئێستایانەو داهاتوو لای ئەوان گرنگ نیە.

من هەرگیز منداڵی تەوەزەلم نەدیوە. ئەو شتەی ناوی دەنێین تەوەزەلی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی حەز و ئۆگریی منداڵ بە بابەتێکی تایبەتی، یان بێ‌بەشیی منداڵ لە سلامەتیی تەواو. منداڵێکی ساغ قەت حەز ناکا بێکار بێ. ماوەیەک لەمەوبەر منداڵێکیان ناردە قوتابخانەی ئێمە کە دەیان گوت تەوەزەلە و نایەوێ پرسیارەکانی دەرسی بیرکاری وەڵام بداتەوە. ئەو لەو کاتەوە پێی نایە قوتابخانەکەمان، ڕۆژێ چەند سەعات خەریکی وەکارخستنەوەی رادیو و ئەو ئامرازانە بوو کە لە کار کەوتبوون. حاڵەتێکی ئەوتۆ نابێ ناوی تەوەزەلیی لەسەر دابنرێ. ئەو وەزعە تەنیا نیشاندەری بێ مەیلیی کوڕەکە بە بیرکاری‌یە و پێوەندی‌یەکی بە تەمبەڵی‌یەوە نیە. چونکە ئەگەر بەراستی تەمبەڵ بوایە هەر ڕۆژەی چەند سەعات بە وەکار خستنەوەی دەزگا شکاوەکانەوە خەریک نەدەبوو.

لەم دوایی‌یانەدا لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە کە ئەو کەسانەی حەز لە هەڵپەرین دەکەن لە هەر کۆڕێکی هەڵپەرین دا بەقەرا چل کیلومیتر بەرێ‌یەدا دەڕۆن و تۆزقاڵێکیش هەست بە ماندوویی ناکەن. هۆیەکەشی زۆر روونە: ئەوان حەز لە هەڵپەرین دەکەن. ئەو قسەیە لە بارەی منداڵانیشەوە هەروایە. بۆ وێنە قوتابی‌یەک کە لە پۆلەکاندا خۆی بە

وانەکانەوە ماندوو ناکا و پێی دەڵێن تەمبەڵ، لە کێ بەرکێیەکی فوتبالدا دەیان کیلومیتر رادەکا بێ ئەوەی چووکترین نیشانەی ماندوویی پێوە دیار بێ.

من هیچ وەخت ناتوانم لە قوتابخانە قوتابییەک ناچار بکەم کە لە باخەوانی و ئاودانی گوڵەکاندا یارمەتیم بدا. چونکە ئەوان پێیان باشترە کاتی ئازادی خۆیان بە وەکار خستنەوە و خاوێن کردنەوەی دووچەرخە و ماتۆرسیکلیتەکانیان تێپەڕ بکەن و یان لایت (چراغ قوە) و رادیوی چکۆلە بۆخۆیان دروست بکەن. زۆر ساڵی خایاند تا من ئەو دیاردەیەم بۆ ڕوون بووە. ڕۆژێک براکەم داوای لێ کردم لە کاری باخچەی ماڵەکەیدا یارمەتیی بدەم. لە حاڵێکدا هاوکاریم دەکرد هەستم بەوە کرد گەرچی کاری باخەوانیم پێ خۆشە، بەڵام چێژ لە کار کردن لە باخچەکەی ئەودا وەرناگرم. چونکە ئەو باخچەیە هی من نەبوو و لەوانەش بوو بەرهەمی کارەکە هەر نەبینم. بۆ منداڵانیش مەسەلەکە هەر بەم چەشنەیە. ئەوان حەز لە پێڕاگەیشتن و خزمەت کردنی دووچەرخە و موتۆر سیکلیتی خۆیان دەکەن چونکە دەست بەجێ بەرهەمی کارەکەیان دەبینن. هاوڕەگەز دۆستی و لە خەمی خەڵکی دابوون زۆر درەنگ بە بیری منداڵاندا دێ و بە هەرحاڵ جۆرێک خۆ ویستییشی لەگەڵە.

ئامادەیی و مەیلی منداڵە کەم تەمەنەکان سەبارەت بە کاروهاوکاریی لەگەڵ گەورەکان، لەگەڵ ئامادەیی مێرمنداڵەکان جیاوازییەکی زۆری هەیە. منداڵانی تەمەن ٣-٨ ساڵە چەشنی کویلەیەک کار بۆ گەورەکان دەکەن. ئەوان بێ ئەوەی چاوەڕوانی هیچ چەشنە حەقدەستێک بن خشتان دەکێشن، لم و چیمەنتۆ لێک دەدەن و هەرکارێکی لەم بابەتەی لێیان داوا بکرێ، بەهاسانی بەڕێوەی دەبەن. چونکە بە ئەنجام دانی ئەو جۆرە کارانە هەست بە گەورە بوون دەکەن. بەڵام لە تەمەنی ٩-٨ ساڵییەوە تا ١٧-١٨ ساڵی، مەسەلەکە بەم جۆرە نیە و مێرمنداڵان بۆ ئەنجام دانی

كارێكى پێیان خۆش نەبێ ئامادەیی نیشان نادەن. ئاشكرایە نموونەی دەگمەن رێ دەكەوێ و هێندێك لە منداڵان هەر لە ساڵانی یەكەمی ژیانەوە تا كۆتایی تەمەن، ئامادەی ئەنجام دانی هەرچەشنە كارێكن.

راستی‌یەكەی ئەوەیە گەورەكان زۆرجار منداڵان دەچەوسێننەوە. ئەوان بەردەوام دەستوور بەسەر منداڵاندا دەدەن: پەرداخێكم ئاو بۆ بێنە، ئەو نامەیە بەرە پۆستخانە، ئەم كارە بكە، فلان كارمەكە و ... . منداڵان نایانەوێ كەلكی خراپیان لێ وەرگیرێ. ئەوان لەسەر ئەو باوەڕەن كە دایك و باب دەبێ پێویستی‌یەكانی خۆشی و حەسانەوەی ئەوان دابین بكەن.

ئەمن پێم وایە لە كۆمەڵ و شارستانەتی‌یەكی سەلامەتدا نابێ داوا لە منداڵانی كەمتر لە ١٨ ساڵ بكرێ كارێك بكەن كە پێیان خۆش نیە. بەڵام بەداخەوە زۆر لە منداڵان ناچارن بە مەبەستی یارمەتی بە ژیان و بژیوی بنەماڵەیان زۆر لە خوارەوەی ئەو تەمەنەدا مل لە كاركردن بنێن. ئەوان هەمیشە ،بێ ئەوەی خۆیان هەستی پێ بكەن. لەو وەزعە نارازین و لەوە كە نەیانتوانیوە چاخی منداڵی و مێرمنداڵی بەو چۆرەی شیاوە، رابوێرن ئازار دەچێژن.

## یـــــاری

لە قوتابخانەی ئێمە، (یاری) یەكێك لە گرنگترین چالاكی‌یەكانە و ئێمە بایەخێكی زۆری بۆ دادەنێین. هۆی چیە منداڵان و بێچووە پشیلەكان تا ئەو رادەیە كەیفیان بە گەمە دێ، بۆ من روون نیە. هەڵبەت مەبەستم لە یاری، ئەوانە نیە كە لە مەیدانە وەرزشی‌یەكاندا بەرێوە دەچن، یان ئەوانە كە بە هاوكاریی دەستەیەك ئەنجام دەدرێن. بەڵكوو ئەو یاری‌یە خەیاڵی‌یانەم مەبەستە كە منداڵە چووكەكان دەیان كەن . یاری‌یە بە كۆمەڵەكان پێویستی‌یان بە رێكخستن (تشكل)، لیزانی، رقەبەری و

کاری بەکۆمەڵ هەیە. کەچی کایەکانی منداڵان رقەبەری (رقابت) یەکی کەمی دەوێ و پێویستی بە لێزانی نیە. بۆ ئەم جۆرە یاری‌یانە کاری بە کۆمەڵیش زۆر پێویست نیە. منداڵە چکۆڵەکان زۆر بە هاسانی دەتوانن بە چەک و شمشێری خەیاڵی لاسایی دزەکان بکەنەوە. چیرۆکێک یا فیلمێکی سینەمایی لەوانەیە کار بکاتە سەر منداڵان و مەبەستێکی تازە بۆ یاری کردن بخاتە مێشکی منداڵان. بەڵام هەرلە جێدا هەوێنی ئۆگری بە کایە و یاری لە دڵی منداڵانی هەموو وڵاتان و رەگەزەکاندا هەیە. چونکە بەر لەوەش سینەما دابهێنرێ، منداڵان یاری‌یەکانی وەک خۆشاروەکێن و قەرێ قەرێن و ... یان پێ خۆش بووە و کردوویانە.

لە قوتابخانە منداڵانی ٦ ساڵە لە بەیانی‌یەوە تا ئێواری بە کایە کردن رای دەبوێرن. ئەوان نوقمی خەیاڵ دەبن و یاریی تازە دادەهێنن. لای منداڵێکی چووکە خەیاڵ و راستی زۆر لێک نزیکن. کاتێک لە نێو دەستەیەک منداڵ، یەکێکیان خۆی لەوانی دیکە دەکا بە دیوەزمە، منداڵە چووکەکان لە خۆشی‌یان دەیکەن بە قریوە. ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا دەزانن دیوەزمەکە یەکێک لە هەڤاڵانیانە کە مەلافەیەکی سپیی بە خۆی داداوە و خۆی بەم جۆرە هەڵخستوە بەوحاڵەش کاتێک لێیان نزیک دەبێتەوە و بۆیان دێ، لە ترسان دەس‌دەکەن بە هات و هاوار و لە بەری هەڵدێن.

منداڵە چکۆڵەکان خەیاڵێکی زۆر زیندوو و پڕ لە هەژانیان هەیە کە بۆ کایە کەلکی لێ وەردەگرن. کوڕانی ٨ تا ١٤ ساڵە ، کاتێک یاریی لاسایی کردنەوەی کانگێستەرەکان دەکەن، بەردەوام خەریکی کوشتنی رواڵەتیی یەکتر و فڕین بە ئاسمانەکاندا بە هۆی فڕۆکە خەیاڵی‌یەکانیانەوەن. کچەکانیش لە قۆناغێکی تەمەندا یاریی لاسایی کردنەوەی چەتە و رێگرەکان دەکەن بەڵام لە شمشێر و دەمانچە کەڵک وەرناگرن.

کوڕانی چووکەڵە لە کاتی یاری کردندا زۆر وایە دەبن بە دوو

تاقمی رقەبەر و دوای تەواوبوونی یاریەکە، رقەبەرایەتی‌یان لەبیر دەچێتەوە و دەبنەوە دۆستی یەکتر . بەڵام کچە چکۆڵەکان وانین و لەوانەیە دوای تەواو بوونی کایەکانیشیان، رقەبەرایەتی‌یان لەگەڵ یەکتر بمێنێ.

ئەمن قەت نەمتوانیوە تێ بگەم کە خەیاڵ و ئارەزوو و لای منداڵان لە کوێوە دەست پێ دەکا و دەگاتە کوێ. کاتێک کچێکی چکۆلە لە دەفرێکی بچووک‌دا چێشت دەنێتە بەردەمی بووکە باغەکەی ئایا لەو کاتەدا وابیردەکاتەوە کە بووکە باغەکەی گیانی لەبەر دایە؟ ئایا ئەو ئەسپە دارینەیەی کوریژگەکان سواری دەبن، لە پێش چاوی وان ئەسپی راستەقینەیە؟ داخوا ئەو کاتەی کوریژگەیەک بە تیخورینەوە دەڵێ: «لە جێی خۆت نەبزووی!» وا هەست دەکا چەکێکی راستەقینەی بە دەستەوەیە؟ من زۆرتر لەسەر ئەو باوەرەم کە منداڵان پێیان وایە لەیستوکەکانیان، راستەقینەن و تا ئەو کاتەی یەکێکی لە خۆیان گەورەتر لە پڕ ئاگای نەکردوونەوە، ئەوان لە جیهانی خەیاڵی خۆیان‌دا درێژە بە کایە دەدەن.

دایک و باوکێکی تێگەیشتوو دنیای خەیاڵیی منداڵەکەیان بە خۆڕایی ناشێوێنن. کوران بە پێی عادەت لەگەڵ کچان یاری ناکەن و زۆرتر یاریی خۆشاروەکێن و لاسایی کردنەوەی دزو چەتەکان و کانگێستەرەکان دەکەن، لەسەر داران بە لک و پۆ وگەڵا هەرزاڵ سازدەکەن و بە زەوی هەڵکۆڵین و تونێل سازکردن و دیوار دانانەوە خەریک دەبن.

کچان کەمتر بە لای یاری‌یە بە کۆمەڵەکان‌دا دەچن. لەو قوتابخانانەدا کە قوتابیان ئازادیی دەربڕینیان هەیە و شوێنەوارێک لە دەسەڵاتخوازیی بەرێوەبەر و هەڵسووڕێنەر و مامۆستایان لە گۆڕێ دا نیە، یاریی لاسایی کردنەوەی مامۆستایان، یان دوکتورەکان بەدی ناکەین. چونکە منداڵان پێویستی‌یان بە لاسایی کردنەوەی ئەو شتە نیە کە

نیشاندەری دەسەڵاتە. کیژۆڵە کەم تەمەنەکان زیاتر یاریی بووک بووکێنێ دەکەن و ئەوانەی تەمەنێکی زۆرتریان هەیە پێوەندی گرتن لەگەڵ ئینسانەکانیان لە کایە کردن بە کەڵ و پەل پێ باشترە: لە یارییە فیکرییەکانی وەک شەترەنج و «پازل» و جۆرەکانی دیکەی یاریی فیکریدا، کچان و کوران دەتوانن بێ هیچ دەردیسەرییەک لەگەڵ یەکتر یاری بکەن.

منداڵان شەیدای هەراو قریوە و کایە کردن بە قوڕ و خاکن. ئەوان لە قاڵدرمەکان بۆ خلیسکێن کەلک وەردەگرن. دەست دەکەن بە قیژە و هاواری لە گوێگران وەمۆبیل و کەل و پەلی نێومال ناپارێزن. کاتێک سەر دەدووی یەک دەنێن و بەدوای یەک دا رادەکەن، گرنگییەک نادەن بەو گوڵدانە چینییە لەمێزینە بایەخدارەی لەبەر پێیانە و لەوانەشە بیشکێنن.

دایکان زۆر جار بە رادەی پێویست یاری لەگەڵ منداڵەکانیان ناکەن. ئەوان وابیر دەکەنەوە ئەگەر بووکە باغەیەک بۆ منداڵەکەیان بخەنە نێو بێشکەکەی، بەشی دوو سەعات یاریی منداڵەکەیان دەکا. نازانن کە منداڵ پێی خۆشە دایکی قدیلکەی بدا و بە ئامێزییەوە بکوشێ.

ئێمە ئەو راستییەمان لەبیر خۆمان بردۆتەوە کە قۆناغی منداڵی، قۆناغی یاری و کایەیە. لە روانگەی گەورەکانەوە کایە یانی بە فیڕۆدانی کات. هەربۆیەشە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆدا قوتابخانەی گەورە بنیات دەنێن و ژووری گەورە و لابراتواری گرانبایی تێدا ساز دەکەن. بەڵام بیری تەرخان کردنی شوێنێک بۆ یاریی منداڵانیان بە مێشک دانایە. رەنگە بەکێک لە دەردە گرنگەکانی کۆمەڵەکانی ئەمڕۆ ئەوەبێ کە بواری ئەوە بە منداڵان نادەین پڕ بە دڵی خۆیان یاری بکەن و لێمان دەوێن بە خێرایی چاخی منداڵی لە بیر بەرنەوە و ببنە ئینسانێکی پێگەیشتوو. شێوە روانین و بیرکردنەوەی گەورەکان سەبارەت بە یاریی کردنی منداڵان بە تەواوی

یەک لایەنە و سەرەرۆیانەیە. ئەوان بەرنامەی ئەوتۆ بۆ منداڵان دادەنێن کە دەبێ لە بەیانی‌یەوە تا دوانیوەرۆ لە قوتابخانەدا بخوێنن و بەدوای نان خواردن و حەسانەوەیەکی کەمدا، سەرلەنوێ تا کاتی خەو خەریکی دەورکردنەوە بن. ئەگەر منداڵان ئەو ئازادی‌یەیان هەبایە کە بەرنامە بۆ خۆیان دابنێن، بەرنامەکەیان جۆرێک رێک دەخست کە ماوەی یاری کردن لە ماوەی خوێندن زۆر درێژتر بوایە.

هۆی ئەسلیی دژایەتیی گەورەکان لەگەڵ یاریی کردنی منداڵان، نیگەرانی لە داهاتوویە. هەزاران جار ئەم پرسیارە لەدایک و باوکەکان بیستراوە کە: «ئەگەر منداڵەکەم تەواوی رۆژەکەی بە یاری کردن رابوێرێ، دەتوانێ هیچ فێربێ؟» وەڵامی منیش کە دەڵێم: «ئەگەر منداڵ دەرەتانی ئەوەی پێ بدرێ بە دڵی خۆی یاری بکا، هەرکات دەرسەکانی دەوربکاتەوە، بە مەرجێک ئۆگری دەرسەکان بێ، دەتوانێ لە ماوەیەکی کەمدا خۆی بۆ تاقیکردنەوەکان ئامادە بکا» زۆر بە کەمی لە لایەن دایک و بابەکانەوە قبووڵ دەکرێ .

نیگەرانیی دایک و بابەکان لە بارەی کار و پیشەی داهاتووی منداڵەکانیانەوە، وای لەوان کردوە بۆ دەرس بایەخێکی زیاتر لە یاری کردن دابنێن. ئەو دایک و بابانەی لە بیریان چۆتەوە چۆن لەگەڵ منداڵەکانیان یاری بکەن و بچنە نێو جیهانی خەیاڵاتی ئەوان، زۆر بە دڵی منداڵان نین. منداڵێک کە لێوەشاوەیی و توانای یاری کردنی لێ بستێندرێتەوە لە باری رەوانی‌یەوە، گیانلەبەرێکی مردووە و هاورێیەتی و هاواڵەتیی بۆ منداڵانی دیکە، زیانی هەیە.

راهێنەر (مربی)ی یەکێک لە ناوەندەکانی فێرەکارکردنی منداڵان کە سەبارەت بە رێ و شوێنەکانی ئەوێ قسەی بۆ دەکردم، دەی‌گوت: لەو ناوەندەدا منداڵان پێ‌یان خۆشە ئەوپەری کار بکەن و هەرکات بمانەوێ لە جیاتی سزادان، پێشی کارکردنی یەکێک لەوان لەمەزرادا بگرین،

منداڵەکە تا ئێوارە دەگری. ئەمن ئەگەر منداڵێکی دەساڵەم بوایە کە سەبارەت بە بێبەش کرانی لە کاری مەزرایە گریابا، وەک منداڵێکی ناسروشتیم دەهاتە بەرچاو. بە بڕوای من ئەو ڕێ و شوێنانە لە خزمەت فێدا کردنی منداڵان لە پێناوی پێویستی‌یە ئابووری‌یەکان دان. ڕەنگە لەباری ئابووری‌یەوە ئەو ڕێگایە پێویست بێ. بەڵام پێم وایە سیستمێکی دروستی پەروەردە کردنی منداڵان نیە.

ئەگەرچی دەستنیشان کردنی ئەو زیان و خەسارانەی لە ئاکامی بێبەشیی منداڵ لە یاریی دڵخوازدا بە بنەماڵە و کۆمەڵ دەگەن، کارێکی دژوارە بەڵام زۆر بەکەلکە. زۆر جاران لە خۆشم دەپرسم ئایا ئەو کۆمەڵە خەڵکەی دەچنە سەیری کێبەرکێ‌یەکانی فووتباڵ و دەکەونە هەژان و هەڵبەزدابەز، بەراستی بە شوێن سەردەمی منداڵیی خۆیانەوە نین کە بەر لە کاتی خۆی تێپەڕیان کردوە؟ ئەوان کە لایەنگری لە یاریکەرەکان دەکەن و هانیان دەدەن، ئەوە لە ڕاستی‌دا خۆیان لە قاپێلکی ئەوان‌دا دەبینن و بە هۆی ئەوانەوە یاری دەکەن. ئەگینا ئەگەر لە تەمەنی منداڵی‌دا تێر بەدڵی خۆیان یاری‌یان کردبایە، لەوانە بوو ئێستا تەماشاکردنی یاریی کەسانی دیکە ماندووی کردبان.

## یاری‌یە شانۆیی‌یەکان، موسیقا و هەڵپەڕکێ

منداڵان کایە شانۆیی‌یەکانی وەک تیشاتریان زۆر پێ خۆشە. لە قوتابخانەکەمان زۆر جاران قوتابی‌یەکان بۆخۆیان شانۆنامە دەنووسن و بەرێوەی دەبەن.

زۆربەی ئەو شانۆنامانەی ئەوان دەیان نووسن نیوەرۆکی کۆمێدی و پێکەنین‌هێنەریان هەیە. کچەکان زیاتر لە کوڕەکان ئۆگری بە نووسینی شانۆنامە یان شیعریان پێوە دیارە. کوڕێژگەکان لە شانۆنامەکانیان‌دا زۆرجاران شەخسییەتێک نیشان دەدەن کە داوای خۆ بەدەستەوەدان لە

لایەنەکانی بەرامبەری دەکا و هەمووان دەداتە بەر دەسڕێژی خۆی.

کچان زیاتر لە کوڕان ئامادەیی کایە کردن لەسەر شانۆیان هەیە، کوریژگەکان تەنیا نەخشی دز و گانگێستەرەکان دەتوانن بە باشی یاری بکەن. بۆ باشتر خۆنواندن لەسەر شانۆ دەبێ بتوانی بچیە قالبی کەسانی دیکەوە. ئەکتەرە گەورەساڵەکان بە هۆی ئاگاییەوە دەتوانن رۆڵی شەخسییەتەکان بنوێنن، بەڵام بۆ منداڵان ئەوە کارێکی دژوارە. زۆر جاران کاتێ لەسەر شانۆ لە منداڵێک دەپرسن تۆ کێی؟ لە بیری دەچێتەوە ناوی ئەو شەخسییەتە بێنێ کە رۆڵی ئەوی پێ سپێردراوە و لە جیاتیان ناوی خۆی دەڵێ.

ماوەیەک لەمەوبەر لە قوتابخانەکەمان شانۆنامەیەک ئیجرا دەکرا. لە دیمەنێکی ئەو شانۆیەدا هێندێک خواردەمەنی لەسەر مێزێک دانرابوو. ئەو منداڵانەی لە شانۆیەکە دابوون هەرکە لە بەجێ هێنانی رۆڵی خۆیان بوونەوە هێشتا پەردە دانەدرابۆوە شاڵاویان بردە سەر خواردەمەنییەکان و گیرفانی خۆیان لێ ئاخنین کە ئەم کارە بووبە هۆی قاقای توندی بینەران.

منداڵان یاری کردنی سەرشانۆیان پێ خۆشە. چونکە ئەم کارە بڕوا بەخۆ بوونیان تێدا دروست دەکا. ئەوان نەخشە کۆمیدییەکان و نەخشی ئینسانە خاوەن پەژارە و ماتەمبارەکان باشتر لە نەخشەکانی دیکە یاری دەکەن.

سەبارەت بە سەما و مۆسیقاش، منداڵان (ئەگەر ناچار نەکرێن، سەما و هەڵپەرکێیەکی نابەدڵ ئەنجام بدەن یان گوێ لە مۆسیقای پێچەوانەی مەیلی خۆیان بگرن) لەسەما و هەڵپەرکێ و گوێ گرتن لە موسیقا چێژ وەردەگرن. سەما هەر لە جێدا دەبێ باری داهێنانی هەبێ و منداڵ دەبێ ئەو ئازادییەی هەبێ ج جموجۆلێکی پێی خۆشە ئەنجامی بدا. سەمای کلاسیکی رۆژئاوا لە جموجۆڵێکی وشک و بێ گیان زیاتر، شتێکی دیکە نیە و منداڵان کەیفیان پێ نایە. چێژ و خۆشیی سەما و

هەڵپەرکێ لە دۆزینەوەی جموجۆڵی نوێ دایە، دەنا هەڵپەرکێ و سەمای میکانیکی چێژێکی نیە[illegible]بارەت بە مۆسیقاش مەسەلەکە هەر وایە و نابێ زۆر لە منداڵ بکەین کە گوێ لە مۆسیقای کلاسیک بگرێ و مۆسیقای رۆژ لە بیر خۆی بەرێتەوە. ئەگەر منداڵ لەو بوارەدا ئازاد بێ و ئۆگری مۆسیقاش بێ، لەوانەیە ئامادەیی بۆ فێر بوونی لێدانی یەکێک لە ئامێرەکانی مۆسیقاش لە خۆی نیشان بدا. بەڵام هەرگیز نابێ بە زۆر فێربوونی سازێک، یان ئەنجام دانی سەمایەکی تایبەتیی بەسەر دا بسەپێنین.

## وەرزش و یاریی بە کۆمەڵ

دەکرێ بڵێین وەرزش لە هەموو قوتابخانەکان ئیختیاری‌یە. لە قوتابخانەی ئێمە وەرزش و یاریی بە کۆمەڵ وەک هەموو دەرسەکانی دیکە، دڵخوازانەیە و قوتابیان لە ئەنجام دان یان ئەنجام نەدانی‌دا سەرپشکن.

یەکێک لە قوتابیانی مەدرەسە، ماوەی ٦ ساڵان لە هیچ دەستەیەکی وەرزشی‌دا بەشدار نەبوو و ئێمەش زۆرمان لێ نەکرد. منداڵە چکۆڵەکان پێکەوە کایەی لاسایی کردنەوەی گانگیستەرەکان دەکەن و چونکە هێشتا نەگەیشتوونە تەمەنێک سوودی هاوکاری تێ بگەن، ئۆگری و بایەخ‌دان بە یاری‌یە بە کۆمەڵەکانیان تێدا بەدی ناکرێ. دیارە شتێکی سروشتی‌یە کە منداڵان هەتا گەورەتر دەبن، سەرنجیان زیاتر بۆ لای وەرزشی بە کۆمەڵ و خاوەن یاسا و رێ و شوێن رادەکێشرێ و ئۆگری دەبن.

تێکرای منداڵان وەرزشی مەلە کردنیان پێ خۆشە، بەڵام لە ئەنجام‌دانی وەرزشە بە کۆمەڵەکان‌دا، زۆر جار لەسەر چۆنیەتیی هاوکاری کردن لەگەڵ یەکتر تووشی قڕە و ناکۆکی دەبن. ئەوان وا بە باش دەزانن هەر یەکە و بۆخۆی یاری بکا. بە گشتی هاوکاری و کاری بەکۆمەڵ لە

دوای ١٧ ساڵی، بێ ژانەسەر دروست دەبێ.

سەبارەت بە پێشکێش کردنی خەڵات بە یاریکەرە سەرکەوتووەکان، ئێمە هەمیشە تووشی گیروگرفت و قسە و باسی دوور و درێژ دەبین. ئەوانەی دژی بەخشینی خەڵاتن دەڵێن: هەر کار و کردەوەیەک دەبێ لەبەر نەفسی کارەکە بەرێوە بچێ نەک بۆ بردنەوەی خەڵات. ئەوان دەڵێن بۆچی دەبێ سەبارەت بە بردنەوەی یاریی تێنیس خەڵات بدەین ، بەڵام بۆ سەرکەوتن لە دەرسی جوغرافیدا، خەڵاتمان نەبێ؟ هۆیەکەی لەوانەیە ئەوەبێ کە لە کێبەرکێیەکی وەرزشیدا دەبێ بەسەر حەریفدا سەرکەوی لە کاتێکدا، لە دەرسی جوغرافیدا حەریفێک نیە کە وەپێش بکەویتەوە. ئەگەر من دەرسی جوغرافی زۆر باشیش بزانم بۆمن چ گرنگییەکی هەیە کە کەسانی دیکە لە من باشتری دەزانن یان نا؟ لەهەر حاڵدا ئێمە ئەوانەی لە کێبەرکێیە وەرزشییەکاندا سەردەکەون، ناکەینە قارەمان و ئەوانەی سەرکەوتن وەدەست دینن، لە قوتابخانەکەماندا، لەگەڵ قوتابییەکانی دیکە هیچ فەرق و جیاوازییەکیان بۆ دانانرێ.

قسە و مەبەستی بنەرەتیی ئێمە ئەوەیە کە: «ئەتۆش بژی و لێگەرێ کەسانی دیکەش بژین».هەر بۆیە ئەگەر قوتابییەک زۆریش ئۆگری وەرزش نەبێ، لیی بە عەیب ناگرین و زۆریی لێ ناکەین.

## پاشەرۆژی قوتابخانەی «سومرهیل»

زۆربەی ئەو بابەتانەی لە چل ساڵی رابردوودا نووسیومن ئاکامی ئەزموون و ژیانم لە نێو منداڵاندا بووە. راستە کە بۆچوونەکانی «فرۆید» و دەروونناسەکانی دیکە کاریان تێ کردووم بەڵام بۆچوونەکانم بەری ئەو ئەزموون و لێکۆڵینەوانەن کە راستەوخۆ لە ئاکامی ژیان لەگەڵ منداڵاندا بۆم دەرکەوتوون.

نووسەری، کارێکی سەرسوورهێنە. کتێبیش وەک رادیو مەبەستێک

بڵاو دەکاتەوە کە لە ژمارە و جۆری ئەوانەی پەیامەکەی وەردەگرن بێ ئاگایە. خوێنەرانی کتێبەکانی من کەسانێکی تایبەتین. ئەوانەی پێیان دەڵێن خەڵکی ئاسایی، من هەر ناناسن. رادیۆی لەندەن هیچ کات داوای لەمن نەکردوە لەبارەی پەروەردە و فێرکردنەوە وتووێژی لەگەڵ بکەم، هیچ زانستگەیەک بە مێشکی دانەهاتوە دیپلۆمی ئیفتیخاریم بداتێ. کاتێک ئەمن بۆ خوێندکارانی ئاکسفورد و کەمبریج کونفرانس پێک دێنم هیچ یەک لە فێرکاران و مامۆستایان ئامادە نابن بێن گوێ لە قسەکانم بگرن. دیارە ئەو کارە دەبێتە هۆی بە خۆنازینی من. چونکە لەسەر ئەو بڕوایەم ئەگەر کەسانی رەسمی پەسندم کەن، مانای ئەوەیە بیروراکانم کۆن و لە مۆد کەوتوون.

جاران کە رۆژنامەی «تایمزی لەندەن» نامەکانی منی بڵاو نەدەکردەوە، تووڕە دەبووم. بەڵام ئێستا وابیر دەکەمەوە کە ئەورۆژنامەیە بەو هەڵوێستەی خۆی، رێزی لێ ناوم.

بەو قسانەم نامەوێ بە ئێوە بسەلێنم کە حەز لە ناوبانگ و ناوبەدەرەوەیی ناکەم. بەڵام سووری دەوران ئاڵ و گۆر بەسەر بایەخەکانی ئینسان دادێنێ. لەم دواییانەدا قسەم بۆ حەوت سەد سوئێدی دەکرد کە بە زەحمەت لە شوێنێکی شەش سەد کەسیدا جێی خۆیان کردبۆوە. لەسەرەتادا پێموابوو ئەو پێشوازییەی لە قسەکانم کراوە ناتوانێ کارم تێ بکا. بەڵام کاتێک لە خۆمم پرسی ئەگەر لە جیاتی ئەو حەوت سەد کەسە تەنیا دە نەفەر بۆ بیستنی قسەکانم هاتبایەن، تووشی چ هەستێک دەبووم؟ بۆم دەرکەوت کە زەبرێکی توندم وێ دەکەوت.

مەقام پەرستی لەگەڵ بەرەو ژوور چوونی تەمەن لە مرۆڤدادەبڕێ. بەڵام نیاز بە دەرکردنی ناو و ناوبانگ شتێکی دیکەیە. ئەگەر لەسەر ئەهلی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە لە بواری پەروەردە و راهێناندا کتێبێک بنووسرێ و ناوی منی تێدا نەبێ، گومانی تێدانیە پێم ناخۆش دەبێ. تا

ئێستا کەسم نەدیوە کە بایەخ بە ڕێز لێ گیران و قەدرزانی و ئەمەگناسی بەرامبەر بە خۆی نەدا.

بۆچوون و ڕوانگەکانی ئینسان لەگەڵ چوونە سەری تەمەن ئاڵ و گۆڕیان بەسەر دادێ. ساڵانێکی زۆر بۆ پێوەندی گرتن بە لاوەکانەوە ـ خوێندکارانی لاو و مامۆستا و دایک و بابە گەنجەکان ـ بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕام. بەڵام ئێستا کە پیر بووم، مەسەلەکان بە جۆرێکی دیکە دەبینم. لەم دواییانەدا کاتێک بۆ نزیک سێ سەدکەس لە خوێندکارانی زانستگەی کەمبریج قسەم دەکرد، هەستم بەوە دەکرد کە لە هەموویان لاوترم. بەوانم گوت: «ئێوە بۆچی پێویستیتان بە پیرێکی وەک من هەیە کە بێ و لەبارەی ئازادییەوە بۆتان بدوێ؟». ئەگەر باش ورد بووبنەوە زۆرجاران دیوتانە کە لاوێکی بیست ساڵە چەشنی کەسێکی نەوەد ساڵە ڕەفتار دەکا و هێندێک جاریش کەسانی ٦٠ ساڵە دەبینن کە وەک کەسێکی بیست ساڵە دەجووڵێنەوە. ئەم وەزعە لە سەداقەت، هەیەجان، ڕاپەڕ، ئالێکی لەگەڵ کۆمەڵ و گەشبینیی وان سەرچاوە دەگرێ.

نازانم لەگەڵ ڕەوتی زەمان ئاکار و تایبەتمەندییەکانی من نەرمتر بوون یان نا؟ ئەوەی من لێی ئاگادارم ئەوەیە کە لە چاو رابردوو کەمتر دەتوانم لەگەڵ کەسانی گەمژە هەڵکەم و زۆر زیاتر لە ڕابردوو بە ئاخاوتن و قسە و باسی بێ تام کە مێشکی بنیادەم ماندوو دەکەن توورە دەبم و سەرەنجام، سەربردە و مێژووی شەخسیی ئینسانەکان وەک پێشوو سەرنجم ڕاناکێشن. هەروەها سەرنجم کەمتر دەپەڕێتە سەر کەل و پەل و حەز لە کڕینی شت ناکەم. لە مێژ ساڵە بۆ کڕینی جل و بەرگی تازە پێم نەناوەتە هیچ فرۆشگەیەک و تەنانەت ئامرازە پێویستەکانی ئیش و کاریش بۆ وێنە، هاچەر، چەکوچ و ئەنبوردەست (پلایس) و ... کە پێشتر لای من بایەخێکی زۆریان هەبوو، سەرنجم بۆ لای خۆیان ڕاناکێشن.

ئێستا قاو و قیژی منداڵان زیاتر لە پێشوو ماندووم دەکا، بەڵام بە هیچ جۆر پێی قەڵس نابم.من ئێستاش ڕێگای منداڵان دەدەم بە کەیفی خۆیان کایە و بزۆزی بکەن. چونکە دەزانم چەند ساڵی دیکە ئەوانیش دەبن بە ئەندامێکی باشی کۆمەڵ. لەگەڵ بەرەو ژوور چوونی تەمەن، ترسی مرۆڤ کەمتر دەبێتەوە، بەڵام دیارە ئازایەتی‌یەکەشی هەروا.

لە رابردوودا کاتێک منداڵێک هەرەشەی دەکرد کە ئەگەر داخوازەکەی جی‌بەجێ نەکەم خۆی لە پەنجەرەوە هەڵ دەدێرێ، بە هیچ جۆر گوێم نەدەدا هەرەشەکەی، بەڵام ئێستا نازانم ئازایەتیی بەرەو روو بوونەوە لەگەڵ ئەو مەسەلەیەم هەیە یان نا؟.

هێندێ کەس لێم دەپرسن ئەم قوتابخانەیە کە بە خۆتەوە بەستراوەتەوە بەبێ تۆ دەتوانێ درێژە بە کارەکەی بدا؟ ئەمن لە وەڵام دا دەڵێم: لە کاری رۆژانەی قوتابخانەدا ژنەکەم و مامۆستاکانیش وەک من گرنگن. مەسەلەی بنەرەتی ئەوەیە کە دوور لە سزا و توند و تیژی و لە ئازادیی تەواودا قوتابیی فێرکەین و پێ بگەیەنین.

داهاتووی قوتابخانەی «سومرهیل» بۆ من زۆر گرنگ نیە. ئەوەی گرنگە ئەو ئەزموونانەن کە لە پەروەردە و فێرکردنی ئازادانەی منداڵ ، وەدەست دێن. هیوادارم راهێنەران و ماموستایان لەو ئەزموونانە کەلک وەربگرن. وەچەی دوارۆژ دەبێ ئەو مافەی هەبێ سەربەستانە پەروەردە بێ. ئەو سەربەستی‌یە بە مانای ئەوین و خۆشەویستی‌یە و تەنیا ئەوین و خۆشەویستی‌یە کە دەتوانێ گیروگرفتەکانی ئینسان چارەسەر بکا و لە گێژاوی مەترسی‌یەکان دەری بێنێ.

# فەسڵی دووهەم:

# ڕاهێنان

* منداڵی سەرکوتکراو و منداڵی سەربەست و سەربەخۆ
* ترس
* خۆ بە کەم زانی و خەیاڵاوی بوونی منداڵان
* هۆیەکانی شکاندن و لەکار خستنی کەل و پەل لە لایەن منداڵانەوە
* درۆزنی
* بەرپرسایەتی
* نەزم و گوێ ڕایەڵی
* سزا و پاداشت
* پیسایی و چۆنیەتیی ڕاهێنانی منداڵان بە پاک و خاوێنی
* شیردانی ساوا و خواردن
* خەو و تەندروستی
* خاوێنی و جل و بەرگ
* ئامرازەکانی یاری پێکردن
* زاق و زرووق
* ڕێ و شوێنی پێکەوە ژیان
* دراوی خەرجی ڕۆژانە
* گاڵتە و قسەخۆشی.

## منداڵی سەرکوتکراو و منداڵی سەربەست و سەربەخۆ

منداڵی سەرکوتکراو منداڵێکە ترسنۆک، شەرمێون، بەنەزم، گوێ ڕایەڵ و فەرمانبەر. لەهەر شار و شەقام و کۆڵانێک دا نموونەی ئەوجۆرە منداڵانە هەیە. منداڵی سەرکوتکراو چەند ساڵ لە تەمەنی لە پشت مێزی پۆلێکی وشک و بێ گیان و لە قوتابخانەیەکی تاقەت بڕدا تێپەڕ دەکا و کاتێک گەورە بوو لە پشت مێزی ئیدارەیەکی بێ گیانتردا دادەنیشێ، یان لە کارخانەیەک دا مل لە کاردەنێ. ملکەچی هەموو چەشنە قودرەت و دەسەڵاتێکە و دەیەوێ هاودەنگی جەماعەت بێ. لە هەر جۆرە ڕەخنەیەک دەترسێ و تەواوی ئەو شتانەی فێریان کردوە، بێ هیچ چەشنە پرسیارێک دەگوێی گرتوون. ئەویش تەواوی گرێ دەروونی‌یەکان، ترسەکان و ناکامی‌یەکانی خۆی بۆ منداڵەکانی رادەگوێزێ.

دەروونناسەکان دەڵێن: زۆربەی ئاڵۆزی‌یە دەروونی‌یەکانی منداڵان لە پێنج ساڵی یەکەمی ژیانیاندا پێک دێ. رەنگە راستتر ئەوە بێ کە بڵێین ئەو ئاڵۆزی‌یانە لە پێنج مانگی و تەنانەت لە پێنج حەوتووی یەکەمی ژیانیاندا پێک دێن و هەتا کۆتایی تەمەن شوێنەواریان دەمێنێتەوە.

سەرکوتی منداڵ هەر لە کاتی لەدایک بوونەوە (بگرە زۆوتر لەو کاتەش) دەست پێ دەکا. کاتێک ژنێکی سەرکوێر کراو منداڵی دەبێ، کێ دەزانێ ناکامی‌یەکانی دایکی لەکاتی دووگیانی‌دا چ شوێنەوارێکی

لەسەر منداڵەکەی داناوە؟

گەورەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە دەبێ لەبەر خاتری ئارامی و ئاسوودەیی خۆیان، منداڵان بە جۆرێک رابێنن کە ئەوان تووشی زەحمەت نەکەن و هەمیشە گوێ رایەڵ و فەرمانبەر بن.

چەند رۆژ لەمەوبەر تووشی دایکێک بووم کە جل و بەرگی زۆر پاک و خاوێنی کردبووە بەر کوڕە سێ ساڵەکەی و هێنابوویە پارک. پاش ساتە وەختێک منداڵەکە بە کایە کردن بە خاک و خۆڵەوە خەریک بوو و جل و بەرگەکەی خۆڵاوی کرد. دایکی دەست بەجێ چینێکی کوتا و بردیەوە ماڵێ. دوای چەند دەقیقە منداڵەکەی لە حاڵێکدا دەگریا، بە جل و بەرگێکی خاوێنی دیکەوە هێنایەوە پارک. هێشتا دە دەقیقە رانەبردبوو کە منداڵەکە سەرلەنوێ جل و بەرگەکەی خۆڵاوی کردەوە. دایک دیسان لە منداڵەکەیدا. پێم خۆش بوو بچمە لای ئەو دایکە و پێی بڵێم: بەم جۆرە کردەوانە منداڵەکەت هەتا هەتایە رقت لێ هەڵ دەگرێ و لە ژیان بێزار دەبێ. داخوا باشتر نیە جل و بەرگی هەرزان بکەیە بەر منداڵەکەت و لە بەرامبەردا لێی گەڕێی بەدڵی خۆی یاری بکا؟

جار و بار هێندێک دایک دەبینم کە لەسەر ئەوەی منداڵەکەیان کەوتوە، لێی دەدەن. زۆر لەو دایک و بابانەی لە ماڵەوە پێوەندییەکی زۆر باشیان لەگەڵ منداڵانیان هەیە، جگەرگۆشەکانیان سەبارەت بە هەڵەیەک کە لە کۆمەڵ و لە پێوەندی لەگەڵ کەسانی دیکەدا لێیان روودەدا، سزا دەدەن. چونکە لە قەزاوەتی ئاسیاوان و دراوسێکانیان لەسەر منداڵەکانیان، دەترسێن یان تەریق دەبنەوە. لە حاڵێکدا ئەگەر بمانەوێ منداڵی ئازاد و سەربەخۆ پێ بگەیەنین دەبێ باوەڕمان بە باشیی سروشتی منداڵ هەبێ. بۆ ئەوەی منداڵی ئازاد و سەربەخۆ پێ بگەیەنین، دەبێ هەر لە سەرەتای ژیانیەوە هەڵسووڕانی جیسمی و دەروونیی وی تەنگەبەر نەکەینەوە. مانای ئەو قسەیە ئەوەیە کە منداڵ هەر کاتێک

برسی بوو دەبێ شیر بخوا نەک ئەو سەعاتانەی بۆی دیاری کراوە. نابێ بەر لەوەی بکاتە وەختی خۆی لێمان بوێ: فێرە ڕۆیشتن بێ، خۆی پاک و خاوێن رابگرێ و میز بە خۆی دانەکا. لەهەر حاڵدا نابێ بەگژی دابچین و لێی بدەین. منداڵی ساوا دەبێ دایم و دەرهەم واهەست بکا کە خۆشیان دەوێ و دەی پارێزن.

رەنگە سەرجەمی ئەوانەی گوتران هەموو لا قبووڵیان بێ. بەڵام رادەیەکی بێ ئەژمار لەوانەی لایەنگری فەلسەفەی ئازادی و سەربەخۆیی منداڵن، ناتوانن بەهاسانی ئەو مەسەلەیە تێ بگەن. ئەوان دەرەتانی ئەوە بە منداڵە چوارساڵەکەیان دەدەن کە هەر کارێکی پێی خۆشە بیکا و بۆ وێنە بە بزمار یان کەل و پەلێکی تیژ بکەوێتە گیانی موبل و شتوومەکی دراوسێکان و دڕبەدڕیان بکا یان بیان شکێنێ. ژمارەیەکی دیکە لە دایک و باوکان وا بیر دەکەنەوە کە نابێ منداڵی دوو ساڵانەیان ناچار بکەن لە سەعاتی دیاری کراودا بخەوێ تا زیانێک بە سرووشتی منداڵەکەیان نەگا. ئەوان دەڵێن: منداڵ ئەو مافەی هەیە چەندی پێی خۆشە بە خەبەر بێ و هەرکات خەو هێلاکی کرد بۆ خۆی دەخەوێ. ئیدی نازانن کە منداڵێکی دووساڵە ناتوانێ بە زمان بڵێ پێویستیی بە خەو هەیە و هەرچەندی وەختی خەوتنی وەدرەنگتر بکەوێ ماندووتر و گرەزۆکتر دەبێ و ئامادە نابێ بچێتە سەرجێ خەوەکەی و بخەوێ. ئاخرەکەشی دایکیشی تووڕە دەبێ و لە حاڵێکدا منداڵەکە دەگری، دەیا دەی‌نوێنێ.

ماوەیەک لەمەوبەر ژن و مێردێکی لاو هاتنە لای من و لێیان پرسیم ئەگەر ڕێگای یاری کردن بە ئاگر لە منداڵەکەیان بگرن داخوا زەبریان لەسەر بەخۆیی و ئازادیی منداڵەکەیان داوە یان نا؟ کاتێک هێندێک کەس دێنە سەردانی قوتابخانەکەمان و دەبینن نەردەمان لە پەنجەرەکان داوە تا منداڵەکان بەرنەبنەوە دیوی دەرێ، یان دەرمانە ژاردارەکانمان لەبەر دەستی منداڵان لابردوە و لە شوێنی تایبەتی دامان

ناون و ڕێگا نادەین قوتابیان لەسەر پلیکانەکان و ڕاڕەوەکان یاری بکەن، سەریان سوڕ دەمێنێ. ئەوان پێیان وایە ئازادی دان بە منداڵ یانی ئەوە کە منداڵ هەر کارێکی پێی خۆشە ئەنجامی بدا.

ئەگەر دایکێک وابیر بکاتەوە چونکە کوڕە سێ ساڵەکەی پێویستی بە نیگارکێشان هەیە، کەوابوو هەقی هەیە لەسەر دەرگای ماڵەکەشیان ئەو کارە بکا، ئەوە لە مانای ئازادی و سەربەخۆیی منداڵ حاڵی نەبووە.

جارێک، خانمێک کچێکی حەوت ساڵانەی خۆی هێنایە لای من و گوتی: «ئاغای نیل! من هەموو کتێب و نووسراوەکانی تۆم خوێندوونەوە و کچەکەم بە گوێرەی بیروڕاکانی تۆ، پەروەردە کردوە».

من چاوێکم بە دەور و بەرداگێڕا و کچەکەیم دیت کە بە کەوشی پیسەوە چۆتە سەر «پیانۆ» ی ژوورەکەم و لە وێوە بازدەداتە سەر موبلەکە. دایکەکەی چاوێکی لە من کرد و گوتی: «بڕوانە چەند سروشتی پەروەردە بووە، ڕاست بە گوێرەی بۆچوونەکانتا» لێرەدا بوو کە من لە خەجاڵەتی‌یان سوور هەڵگەڕام.

بۆ زۆر لە دایک و بابەکان، تێگەیشتنی جیاوازیی نێوان ئازادی و ئاژاوەخوازی، دژوارە.لەو بنەماڵانەدا کە ڕێ و شوێنی توند هەیە، منداڵ ئازادیی هیچ کارێکی نیە. لە بنەماڵە بێ نەزمەکانیش‌دا دەتوانێ هەر کارێکی پێی خۆشە بیکا. لەو بنەماڵانەدا کە ڕەفتارێکی دروست بەرێوە دەچێ منداڵان و گەورەکان مافی بەرامبەریان هەیە.

ئەمن ناچارم بەردەوام دووپاتی بکەمەوە کە ئازادی بە مانای بێ سەرەوبەرەیی و ئاژاوە خوازی نیە. ئەگەر منداڵێک بیهەوێ لە سەر مێزی نان خواردن گاگۆڵکە بکا، دەبێ پێشی پێ بگیرێ و ئەویش دەبێ گوێ ڕایەڵ بێ. بەڵام ئەگەر بیهەوێ لە ژوورەکەی بچێتە دەرێ، ئێمەش دەبێ بە قسەی بکەین. ئەگەر منداڵێک دەیەوێ یاری بە ئاگری جگەرە بکا، دایک یان باوک نابێ ڕێگا بدەن دەستی خۆی بە ئاوری جگەرەکە

بسووتێنێ بۆ ئەوەی تێ بگا ئەو كارە پڕ مەترسی‌یە. بەڵكوو دەبێ بێ ئەوەی بەسەری‌دا بكوڕێنن ئاورەكەی لێ دوور بكەنەوە.

بەختیاریی منداڵ بەو خۆشەویستی‌یەوە بەستراوەتەوە كە لە دایک و بابی دەی‌بینێ. دەبێ لە منداڵ تێ‌بگەین و قبووڵ بكەین كە بوونەوەرێكی خۆ ویستە. كاتێک منداڵێكی دەساڵە لە نامەدا بۆ دایكی دەنووسێ: «دایكی خۆشەویستم! تكایە دووسەد تمەنم بۆ بنێرە. هیوادارم تۆ و باوكم وەزعتان باش بێ». دایک و باب نابێ لۆمەی بكەن و بڵێن بڕوانە چەندە لە خۆرازی و بێ تەربیەتە. ئەوان دەبێ قبووڵ بكەن كە منداڵ لەو تەمەنەی دا بیروڕای خۆی بەسەداقەتەوە دەردەبڕێ و بەر لە هەموو شتێک خۆی بۆ گرنگە.

منداڵ ئەگەر بزانێ خۆشیان دەوێ و جێگای متمانەیە، زۆر زوو بەرپرسایەتیی كردەوەكانی دەگرێتە ئەستۆ. بەڵام ئەگەر بڕوای پێ نەكەین، هەستی پێ دەكا و دژكردەوەی خراپ نیشان دەدا. بۆ بڕوا كردن بە منداڵان، پێویستە ئێمە باوەڕمان بە خۆمان هەبێ. ئێمە دەبێ خۆمان و هاندەرەكان (محركات) ی خۆمان بناسین. هەتا خاڵە بەهێز و لاوازەكانی خۆمان زیاتر بناسین، پتر بڕوا بە خۆمان دێنین و هەتا زۆرتر بڕوا بە خۆمان بكەین، بە دڵنیایی و باوەڕێكی پتەوترەوە ئازادی بە منداڵەكەمان دەدەین.

دایک و بابەكان هەرگیز نابێ وەک دەسەڵاتدارێک لەگەڵ منداڵەكانیان بجووڵێنەوە و بە زۆر و زۆرداری ئەوان ناچار بە قبووڵ كردنی بایەخەكانی خۆیان بكەن. ئەو كارە دەبێتە هۆی بێزار بوونی منداڵان لە دایک و بابەكانیان و تووشی نەخۆشیی دەروونی‌یان دەكا. دەبێ تا ئەو جێگایەی دەلوێ، ئاكاری منداڵ تەئیید بكرێ. چونكە منداڵ پێویستی بە تەئییدكران لە لایەن گەورەكانەوە هەیە. منداڵ كە هەست بكا خۆشیان دەوێ، ئاكاری سادقانە لە خۆی نیشان دەدا. منداڵ دەبێ بە

دایک و بابی دڵخۆش بێ و لێیان نەترسێ.

ڕێگام بدەن ئامۆژگاری‌یەکی ئێوەی بەڕێز بکەم کە پاش ڕۆژێک کار و هەڵسووران، ماندوو و مردوو دەچنەوە ماڵێ و منداڵەکەشتان زۆر خۆش دەوێ. دەزانم کاتێک منداڵە شەش مانگەکەتان ڕاست سەعات دوازدەی شەوێ کە تازە خەوتان لێ کەوتوە، دەست دەکا بە گریان، لەو ساتەدا ئەوتان زۆر خۆش ناوێ. بەڵام دڵنیا بن ئەو بێهۆ و لە خۆڕا ناگری. تووڕە مەبن و بەتایبەتی تووڕەیی خۆتان بە گوڕاندن بەسەر منداڵدا، دەرمەبڕن. چونکە منداڵێکی ساوا لە گوڕڕەی پیاوێک زۆر زیاتر لە تێڕاخوڕینی ژنێک دەترسێ. لە باوەشتانی بکەن و تا دەتوانن ماچی بکەن. پێتان وانەبێ ئەگەر خۆی تێ نەگەیەنن، بۆخۆی ڕادێ و تا بەیانی دەنوێ.

کاتێک گەورەتر بوو، هەرگیز پێی مەڵێن من لە تەمەنی تۆدا ئەمەم دەکرد و ئەوەم نەدەکرد. هەرچۆنێکی هەیە تەحەمولی بکەن و هەوڵ مەدەن ڕاست بیێنە کەسێکی وەک ئێوە. لێی گەڕێن وەکی بۆخۆی دەیەوێ بژی. لەگەڵی هێمن و لەسەرەخۆ بن با ئەویش بتوانێ لەگەڵ کەسانی دیکە هەر بەم جۆرە بجووڵێتەوە.

## تـــــــرس

ئەمن ماوەیەکی زۆر لە تەمەنی خۆم بە لەنێو بردنی ئەو ئاڵۆزی‌یە دەروونی‌یانەوە کە لە ئاکامی ترسی خۆڕایی لە منداڵاندا پێک هاتوون، ڕابواردوە. ترس لەوانەیە لە ژیانی منداڵدا شوێنەوارێکی پڕ مەترسیی هەبێ. ترس لە گەورەکان، ترس لە سزادران، ترس لە وەرگرتنی نومرەی خراپ و ... . دەبێ هەوڵ بدرێ تا ئەو جێگایەی دەکرێ ترس لە ژیانی منداڵ دوور خرێتەوە. بە چاندنی تۆوی ترس لە منداڵدا، ماڵ و قوتابخانە لە منداڵ دەبن بە جەهەننەمێکی بێز لێ کراو.

هەمــوو کــەس لە ژیانیدا ترسی زۆر شــتی هەیە. زۆر لە ئێمــە لە دەسکورت بوون، لەوە کە ببێنە گاڵتــە جاڕی کــەسانی دیکە، لە دێو و درنج، لە دز، لە ڕووداوی نەخــوازراو، لە بۆچوونی خــەڵک لە بارەی خۆمان، لە نەخۆشی ، لە مردن و ... دەترسێین.

ژیانی هەر ئینسانێک پڕە لە ترسی جۆربەجۆر. بە میلیون ئینسان هەن کــە بە ترســەوە بە شــوێنی تاریک‌دا ڕادەبرن. هەزاران کــەس هەن کاتێک کە پۆلیس لە دەرگای ماڵەکەیان دەدا، ترسیان ڕێ دەنیشێ. زۆر لەوانەی بە سواری گەمی دەچنە سەفەر، یان بە فڕۆکە سەفــەر دەکەن، ترسی ئەوەیان هەیە گەمی‌یەکــەیان ژێر ئاو کــەوێ، یان فــڕۆکــەکــەیان بکەوێتــە خوار. زۆر لەوانەی بە پاس سەفەر دەکەن، لە کورسی‌یەکانی نێوەڕاستی پاســەکــەدا دادەنیــشن تا ئەگــەر پاســەکە تووشی ڕووداوی نەخوازراو بوو، زیانێکی کەمتریان پێ بگا. پارێز (احتیاط) هەمیشە یەکەمین فیکرە کە بە مێشکی مرۆڤ دادێ.

لە سەردەمەکانی پێشوو دا، ئەو کاتەی مرۆڤ هێشتا لە لێرەوارەکان دا دەژیا، ترس لە مردن دەبووە هۆی ئەوە کە مرۆڤ لەبەر مەترسی ڕاکا و خــۆی بشــارێتــەوە. چونکە ئەو کات دەزگــا و تــەشکیــلاتێک نەبوو لە بەرامــبــەر مــەترسی‌دا، بی‌پارێزێ. ئەمــڕۆ لەگــەڵ ئەوەش‌دا کــە نیــزامی کۆمەڵایەتی، ئێمە لە بەرامبەر زۆر مەترسی‌دا دەپارێزێ، بەڵام ئێمە زۆر زیاتر لە ئینسانەکانی سەردەمی بەرد، دەترسێین. ئینسانە سەرەتایی‌یەکان لە دێوەزمە، دەترسان. ئەمڕۆش ئێمــە هەزاران دێوەزمــە ـ شەمەندەفەر، گەمی، ماشێن، فڕۆکە، دزو ... ـ مان هەیە و لێیان دەترسێین. دیارە زۆر جار ترس بۆ زیندوو مانەوە شتێکی پێویستە. ترسە کە ناچارم دەکا بە پارێز و وشیاری‌یەوە لە شەقام بپەڕمەوە.

لە سروشت‌دا ، ترس یەکێک لە پێویستی‌یەکانی مانەوە (بقا)یە. ئەگەر ئەسپ و کەروێشک و زۆر گیانلەبەری دیکە، هەتا ئێستاش لەسەر

رووی زەوی ماونەوە، هی ئەو ترسەیە کە ناچاری کردوون لە بەر مەترسی هەڵێن. ترس یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی پاسای لێزەوارە و گیانلەبەرە بچووک و لاوازەکانی ناچار کردۆ لەبەر گیانلەبەرە گەورە و بەهێزەکان هەڵێن و خۆیان بپارێزن.

ترس هەمیشە شتێکی خۆویستانەیە. ئێمە سەبارەت بە خۆمان و ئەوانەی خۆشمان دەوێن، دەترسێین. بە تایبەتی لەبەر خۆمان. بۆ خۆم کاتێک کورێژگەیەک بووم شەوانە نەمدەوێرا بۆ کڕینی شیر بچمە دێ. بەلاّم ئەگەر خوشکە چکۆلەکەم لە گەڵم بوایە نەدەترسام. ترس ریشەی غەریزی و خۆویستانەی هەیە. چونکە هەر ترسێک لە راستی‌دا ترسان لە مەرگە. قارەمان ئەو کەسەیە کە بتوانێ ترسەکەی خۆی بکا بە ئینێرژی‌یەکی بە کەڵک، یان بە سەری‌دا زاڵ ببێ: بۆ شەرکەرێک ترس لە ترسان ، پڕمەترسی‌ترین شتەکانە. مرۆڤی ترسنۆک ناتوانێ ترسەکەی خۆی بکا بە هێز و ئینێرژی‌یەکی بەکەڵک. ژمارەی ئینسانە ترسنۆکەکانی جیهان زۆر زیاتر لەوانەیە کە ناترسێن.

هەمووی ئێمە ترسنۆکین. هێندێک دەتوانن ترسەکەی خۆیان بشارنەوە و هێندێکیش ئەوەیان بۆ ناکرێ. ترسان و ترسنۆکی هەمیشە شتێکی نیسبی‌یە. ئێوە لەوانەیە لە ئەنجامدانی کارێک‌دا زۆر ئازابن بەلاّم لە کارێکی دیکە بترسێن. لە بیرمە چەندین ساڵ لەوەپێش کاتێک خزمەتی سەربازیم دەکرد، دەستەکەی ئێمەیان بۆ فێربوونی نارنجۆک هاویشتن بردبووە مەیدانی تەقەکردن. لەوێ یەکێک لە ئەندامانی دەستەکەمان چونکە نەی‌توانی نارنجۆکەکەی بە دروستی بهاوێ، نارنجۆکەکەی لە نزیک ئێمە تەقی‌یەوە و چەند کەسی بریندار کرد. بە خۆشی‌یەوە لەو رووداوەدا کەس نەکوژرا. ئەو رۆژە راهێنانەکەیان وەستاند. بەلاّم بۆ سبەینێ کاتێک نۆبە گەیشتە من نارنجۆک باوێم لە ترسان وەک بیی نێو ئاو دەلەرزیم. شەرپەرستەکەمان کە «گروهبان» یک

بوو، بە سـووکـایەتی پێ کـردنەوە لێی روانیم و گـوتی : بەراسـتی ترسنۆکی. دیارە منیش قسەکەیم سەلماند چونکە بەراستی دەترسام.

ئەم «گروهبان» ە کە بۆخۆی قارەمانێک بوو، هەر نەیدەزانی ترسی جیسمی چیە. بەلاّم ماوەیەکی زۆر دوای ئەو رووداوە، رۆژێک هاتە لام و گوتی: هەرکات تۆ بۆ راهێنانە نیزامییەکان دێیە دەستەکەی ئێمە، من زۆر نیگەران و ناراحەت دەبم و ترس دام دەگرێ. بەسەر سوورمانەوە پرسیم لەبەرچی؟ گوتی چونکە تۆ لیسانسی ئەدەبیاتت هەیە و منیش چونکە لە رێزمان و ئەدەبیات دەترسێم، هەر کە تۆ دەبینم دەکەومەوە یادی رێزمان و ترسم رێ دەنیشێ. بۆم دەرکەوت من چەندە لە هاویشتنی نارنجۆک و راهێنانە نیزامییەکانی دیکە دەترسم ئەویش بەو رادەیە لە رێزمان و رستەسازی دەترسێ.

دەروونناسی ناتوانێ روونی بکاتەوە کە بۆچی منداڵێک بە ترسنۆکی لە دایک دەبێ و یەکی دیکە هەر زگماک ئازایە. بارودوخی ژیان و هەل و مەرجی رووحی و کۆمەلاّیەتیی دایک و بابەکان لەوانەیە لە ئازابوون و ترسنۆک بوونی منداڵەکانیاندا شوێنی هەبێ. ئەگەر دایک و باب بە نیاز نەبوون منداڵیان ببێ، بەلاّم تووشی منداڵی نەخوازراو بووبن لەوانەیە ترس و نیگەرانیی دایک لە کاتی بوونی منداڵەکەدا، شوێن دابنێتە سەر کۆرپەکەی. وێ دەچێ منداڵێکی ئەوتۆ هەر زگماک بە سروشت شەرمێون یان ترسنۆک بێ. راستییەکەی ئەوەیە روون کردنەوە و رادەی شوێن دانانی رەفتاری دایک و بابەکان لەسەر منداڵێک کە هێشتا لە دایک نەبووە لە توانای ئێمە بەدەرە. بەلاّم قسەی تێدانیە کە دژکردەو و هەڵس و کەوتی ناشیانەی دایک و بابەکان بەرامبەر بەو منداڵانەیان کە تازە لە دایک بوون، شوێنەواری زۆر نالەبار لەسەر کۆرپەکانیان دا دەنێ.

یەکێک لە ترسەکان کە لەوانەیە حاڵەتێکی گشتی تری هەبێ، لە خەوتنی منداڵەکان لە ژووری خەوی دایک و بابەکانیانەوە سەرچاوە

دەگرێ. منداڵێکی چوارساڵە زۆر شت دەبیسێ و دەبینێ کە تێگەیشتنیان بۆ ئەو دژوارە. لە وەزعێکی ئاوادا منداڵ، باوکی وەک زۆردارێک دێتە بەرچاو کە دەیەوێ کەلکی خراپ لە دایکی وەربگرێ. سادیسم (خۆئازاردان) لەو تێگەیشتنە چەوتە و لەو ترسەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە ساڵەکانی یەکەمی ژیانی منداڵ‌دا، لە ئاکامی دیتنی پێوەندیی ژن و مێردایەتیی دایک و باوک و خەوتنی منداڵ لە ژووری خەوی دایک و بابی‌دا پێک دێ.

جۆرێکی دیکە لە ترس کە لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ هەڵس و کەوتی ناشیانە و نەزانانەی دایک و بابەکان، هەڵوێستی چەوت و نادروست بەرامبەر بە مەسەلە جینسی‌یەکانی منداڵانە. شارەزایەکی بە ناوبانگی دەروونناسی رۆژێک لە بارەی ئاڵۆزی‌یەکی دەروونیی لاوێکەوە قسەی بۆ کردم کە لە ئاکامی کردەوەیەکی هەڵەی باوکی‌دا بۆی پێک هاتبوو. ئەو دەی‌گوت: ئەو لاوە کاتێک ٦ ساڵە بووە، رۆژێک لەگەڵ کچێکی ٧ ساڵە، لە حاڵێک‌دا زۆربەی لەشیان رووت و بەدەرەوە بووە، پێکەوە یاری‌یان کردوە. باوکی بە سەریان‌دا هاتووە و ئەوی تێر و پڕ کوتاوە. ئەم چەشنە رەفتارە ئەو منداڵەیان کردوە بە بوونەوەرێک کە تا لە ژیان دایە بە داماوی و ترسنۆکی بمێنێتەوە.

لە قوتابخانە، کوڕێکی چکۆلەمان هەبوو کە دایکی پێی گوتبوو ئەگەر دەست لە ئەندامی نێرینەی خۆی وەربدا، ئەو ئەندامەی هەڵ‌دەوەرێ! ئەم شێوە ترساندنەی منداڵان ئاکامێکی زۆر دڵتەزێنی دەبێ. ئەزموونی چەندین ساڵی ژیانم منی گەیاندۆتە ئەو ئاکامە کە ئەم جۆرە ترسە لە نێو کچان و کوڕان‌دا شتێکی گشتی‌یە. کاتێک ئاوا ناشیانە منداڵێک لە مەسەلە جینسی‌یەکان دەترسێنین، لە راستی‌دا ئەم جۆرە مەسەلانەی لێ ئاڵۆزتر دەکەینەوە. زۆر لەو منداڵانەی شەوانە دەترسێن، ئەوانەن کە وەحشەتیان لە خەیاڵ و بۆچوونە جینسی‌یەکانی خۆیان هەیە یان لەگەڵ

ئازاری ویژدان بەرەو روون. ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ نائاگایی دایک و بابەکان. چونکە ئەوان نەیانتوانیوە منداڵەکانیان بەو جۆرە کە دروستە لەگەڵ ئەم جۆرە مەسەلانە ئاشنا بکەن و تەنیا بە ترساندن لە جەهەنەم یان بە لێدان و کوتان ویستوویانە ئەم کۆسپانە لەسەر رێ لابەرن. سزادانی منداڵان لەسەر مەسەلە جینسی‌یەکان و هەڵس و کەوتی جووت لەگەڵ ئەوان لەو پێوەندی‌یەدا، دڵنیاترین رێگەی ترسنۆک بارهێنانی ئەوانە و ترساندنی ئەوان لە تەنبێ و سزاکانی دنیای دیکەش، ئاکامێکی لەوە باشتری نابێ.

با هەوڵ بدەین لە نێوان ترسی سروشتی و ترسی خۆڕایی‌دا جیاوازی دابنێین. ترسان لە بەور و گورگی دڕندە ترسێکی سروشتی و پێویستە. ترسان لە شۆفێرێکی ناشی کە تیژ دەڕوا، سروشتی‌یە. ئەگەر نەترسابایەن هەموومان ژێرماشین دەکەوتین. بەڵام ترسان لە قالۆچە و دێو و درنج نە سروشتی‌یە و نە پێویستە، بەڵکوو ترسێکی نەخۆشانەیە.

لە ئوستڕالیا، ترسان لە جاڵجاڵۆکە شتێکی بەجێ‌یە. چونکە پێوەدانی جاڵجاڵۆکەکانی وێ لەوانەیە مرۆڤ بکوژێ. بەڵام لە ئینگلیستان و ئەمریکا ترسان لە جاڵجاڵۆکە شتێکی بێ جێ‌یە. چونکە جاڵجاڵۆکەکانی وێ مەترسی‌دار نین.

زۆرجار لە کووچە و کۆڵانان گوێم لێ دەبێ دایکێک بە منداڵەکەی دەڵێ: «ئەو کارەی مەکە ئێستا پۆلیس دێ» . یەکێک لە ئاکامەکانی ئەو کارە ئەوە دەبێ کە منداڵ بۆی دەردەکەوێ دایکی درۆزنە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە پۆلیس لەبەرچاوی منداڵ دەبێتە دێو و درنج و هەمیشە لە ژاندارم و پۆلیس دەترسێ.

زۆر لە ترسەکانیش ریشەیان لە بیر و خەیاڵی تاوانبارانە و تۆڵە ستێنانەی ئێمە دایە. ئێمە هەموومان لە فیکر و خەیاڵی خۆماندا، زۆر لەو کەسانە دەکوژین کە خۆشمان ناوێن. من دڵنیام کاتێک لە قوتابخانە

منداڵێکی پێنج ساڵە داوایەکم لێ دەکا و بۆی جێبەجێ ناکەم، لە خەیاڵی خۆی‌دا من دەکوژێ تا داواکانی وەدی بێن.

لە قوتابخانە، زۆرجار قوتابی‌یەکانم بە تفەنگە دارینەکانیان کە پڕ لە ئاون، ئاوم پێ‌دا دەکەن و بەسەرم‌دا دەگوڕێنن: «دەست هەڵێنە، کوژراوی» ! بەو جۆرە، ئەوان سەمبولی دەسەڵاتیان کوشتوە و خۆ لە ترسەکانیان رزگار دەکەن. هێندێک رۆژ لە قوتابخانەکەمان بە ئەنقەست لەگەڵ منداڵانی دەسەڵاتدارانە دەجووڵێمەوە تا شوێنەواری ئەو کارەم لە شەڕە تفەنگی ئەو رۆژەیان‌دا هەست پێ بکەم. رۆژانێ وا، هەوڵی لەنێو بردنی من لە یاریی شەڕە تفەنگی ئەوان‌دا، بەرچاوترە.

چەند ساڵ لەمەوبەر هاوینێ بۆ تێپەڕ کردنی کاتی پشوودان لەگەڵ قوتابیانی «پانسیون» چووبوومە لێواری دەریا. یەکێک لە کچەکان بە گاڵتە سەری دەستە خوشکەکانی قوم دەکرد و ماوەیەک لە بن ئاوێ رای دەگرت. ئەو کارە بوو بە هۆی ئەوە هەر ئەو کچە قوتابی‌یە لە پاشەرۆژدا تووشی ترسێکی نەخۆشانە بێ و لەگەڵ ئەوەش‌دا کە مەلەوانێکی بەتوانا بوو، نەوێرێ لە شوێنە قووڵەکان‌دا مەلە بکا. چونکە بێ‌ئەوەی بە خۆی بزانێ لە خەیاڵی خۆی‌دا تووشی ئەو هەستە ببوو کە دەستە خوشکەکانی لەژێر ئاودا خنکاندوون و ئێستا لە ترسی ئەوە کە تۆڵەی لێ بکەنەوە و هەر بەو شێوەیە و بەراستی لەژێر ئاودا بی‌خنکێنن، لەمەلە کردن لە شوێنە قووڵەکان‌دا خۆی دەپاراست.

یەکێکی دیکە لە منداڵەکان، هەرکات بابی بۆ مەلە کردن پێی دەنایە نێو ئاو، دەستی دەکرد بە هات و هاوار و لە بابی دەویست مەلە نەکا. ئەو لەوە دەترسا کە باوکی بخنکێ. هۆی ئەم نیگەرانی‌یە ئەوە بوو کە ئەو منداڵە زۆر جاران کە باوکی ئەزیەتی دابوو، مەرگی بابی بەئاوات خواستبوو. هەربۆیە لە کاتی مەلە کردنی باوکی دا، هەمیشە نیگەرانی ئەوە بوو کە ئەگەر باوکی بەراستی بخنکێ، تاوانەکە پێی وی بگرێتەوە.

بۆیە هەر کە بابی دەیویست مەلە بکا دەیکردە هات و هاوار. دیارە مردن لە روانگەی منداڵانەوە، لەگەڵ مانای مردن لە روانگەی گەورەکانەوە، جیاوازیی هەیە. لە روانگەی منداڵێکەوە مردنی کەسێک یانی لاچوونی ئەو کەسە لەبەرچاوی وی. من لە نێو گەورەکانیشدا زۆرم دیون کە بێئەوەی بەخۆ بزانن، خۆیان بە بەرپرسی مەرگی دایک یان باوکیان دادەنێن. ئەگەر دایک و بابەکان بە تەنبێ کردن و سەرکۆنە کردنی بەردەوامی منداڵەکانیان، ئەوان نوقمی رق و بێزاری نەکەن، شوێنەوارە دڵتەزێنەکانی ئەم جۆرە ترسانە زۆر کەم دەبنەوە. بەداخەوە ئێستاش زۆر قوتابخانە هەن کە رێگای سزادانی جیسمیی قوتابییەکان دەگرنە بەر و بەم جۆرە شوێنەواری زۆر دڵتەزێن و قەرەبوو نەکراو لەسەر قوتابیان دادەنێن.

خەڵکێکی زۆر وابیر دەکەنەوە ئەگەر منداڵ ترسی هیچ شتێکی نەبێ نابێ بە ئینسانێکی پاک و خاوەن شەرەف. ئەوان دەبێ بزانن راستی و ئاکار جوانییەک کە ئاکامی ترسان لە جەهەننەم و پۆلیس و سزادان بێ، راستی و ئاکار جوانی نیە، بەڵکوو ترس و داماوییە.

ئەمرۆ لە ژێر ناوی بارهێنان و فێرە نەزم کردندا ، منداڵانی ترسنۆک و داماو پێ دەگەیەنێن و ئەوان لە ژیان دەترسێنن. هەزاران مامۆستا وفێرکاری ئۆگری منداڵ پێ ئەوەی قوتابی لە نومرەی «انضباط» و یان سزادان بترسێنن، دەتوانن بەرنامەی داهێنەرانە و دڵگر بۆ فێرکردنی منداڵانی قوتابی ئامادە بکەن. منداڵان لەوانەیە لە ئێمە بترسێن و لەترسان یان لە ژێرفشاردا رێ و شوێن و بایەخەکانی ئێمە قەبووڵ بکەن. بەڵام داخوا ئەو مەسەلانەی لە روانگەی ئێمەوە جێی ئیعتیبار و بایەخدارن، چن؟ ئەم حەوتوویە پووڵێکی زۆرم داوە بە سیغار و خرتو پرتی دیکە. ئەگەرچی تارادەیەکی زۆریش خەمی گیروگرفتە کۆمەڵایەتییەکان و هەژارەکانم لەبەربوو، پووڵەکەم لەوان خەرج نەکرد.

کەوابوو نابێ بکەومە ئامۆژگاری کردنی منداڵان کە دەبێ هەمیشە لە فکری هەژاران‌دا بن و وابکەن و وانەکەن. پێشتر زۆرم لەو قسانە دەکرد و بە منداڵانم دەگوت ئەم کارە باشە و فلان کار خراپ. بەلام دوایە کە بۆم دەرکەوت ئەوەش شێوەیەک لە چاوبەست و درۆکردنە، وازم لێ هێنا.

بەختیارترینی ئەو بنەماڵانەی من دەیان ناسم ئەوانەن کە دایک و بابەکانیان بە سەداقەت و راستی‌یەوە لەگەڵ منداڵانیان دەجووڵێنەوە. لەم جۆرە بنەماڵانەدا شوێنەوارێک لە ئامۆژگاریی پەیتا پەیتا و ترس بەدی ناکرێ. باب و کوڕ هاوڕێی یەکترن. لەم جۆرە بنەماڵانەدا ئۆگری و ئەوین برەو پەیدا دەکا و هەست بە رێز لێک گرتنی بە درۆ ناکرێ. لە نێو زۆر لە بنەماڵەکان‌دا عیشق و خۆشەویستیی راستەقینە لە ئاکامی رێزنانی زۆرەملی لە گەورەکان و ترسان لەوان‌دا، کوێر دەبێتەوە.

لە قوتابخانەی ئێمە، ئەو منداڵانەی لە دایک و بابیان دەترسێن هەمیشە بە دەوروبەری مامۆستاکان‌دا دەخولێنەوە. بەلام ئەو قوتابیانەی ترسێکیان لە دایک و بابیان نیە و پێوەندی‌یان لەگەڵ ئەوان بە تەواوی دۆستانەیە، لە دەوری ئێمە نابینرێن. منداڵە ترسنۆکەکان بەردەوام بە دەوروبەری دەفتەری مەدرەسەدا دەسووڕێنەوە و سەری پێ‌دا دەکەن. کوڕێکی یازدە ساڵە هەبوو کە زۆر لە باوکی دەترسا. وەختێک هاتە قوتابخانەکەمان رۆژێ بیست جار سەری بە ژوورەکەی من دادەکرد تا بزانێ من لەوێم یان نا؟ هێندێک جار کە لە تامی دەبردە دەر پێم دەگوت: «مەترسە، جارێ هەر ماوم!» . ئەو کوڕە دەیەویست ئەو ئۆگری و خۆشەویستی‌یەی بابی پێ‌یەوە رەوا نەدیبوو، لەمنی‌دا بدۆزێتەوە. هەربۆیە نیگەران بوو کە ئەو بابە تازەیەشی لە کیس بچێ.

رەنگە ژیان لەگەڵ ئەو منداڵانەی لێتان دەترسێن، لە ژیان لەگەڵ ئەوانەی کە لێتان ناترسێن و خۆشیان دەوێن، ئاسوودەتر و بێ دەردی‌سەرتر بێ. چونکە ئەو وەختەی منداڵ لێتان دەترسێن، هەوڵ دەدەن

هەرچی کەمتر بینە لاتان و زەحمەتێکتان بۆ دروست نەکەن. لە پانسیۆنی ئێمە، زۆربەی منداڵان لەگەڵ مِن و خێزانم و مامۆستاکان تێکەڵاوی یان هەیە و خۆشیان دەوێین. چونکە ترسێکیان لە ئێمە نیە و جێگای پەسندی ئێمەن. ئەوەش راست ئەو شتەیە کە ئەوان دەیانەوێ:

ئەمن بۆم دەرکەوتوە کە منداڵە بچووکەکان زۆر بە کەمی لە دەنگی هەورە تریشقە دەترسێن. زۆر جار رێ کەوتوە لە هەوایەکی زۆر تۆفانیدا، لەو سەری باخی قوتابخانەکەمان‌دا چادریان هەڵداوە و شەوێ لەوێ ماونەوە. کەم واهەیە لە تاریکی و تەنیاییش بترسێن. جاروبارە کورێکی هەشت ساڵە دەچێ لەو سەری باخەکە خێوەت هەڵ دەدا و بێ ئەوەی تۆزقاڵێک بترسێ لەسەر یەک چەند شەوان لەوێ دەخەوێ. ئازادی هەمیشە ئازایەتی و نەترسیی مرۆڤ بەهێز دەکا، زۆرم دیوە ئەو منداڵانەی بە چکۆلەیی شەرمێون و کەمڕوو بوون بە گەورەیی بوون بە ئینسانێکی ئازا و نەترس. بەڵام رەنگە ئەوە لەبارەی هەمووانەوە راست نەبێ. هێندێک لەو منداڵانەی لە پاڵ خۆیان دان قەت ناگۆڕێن و لەوانەیە هەتا مردن دەستە ملانی ترسەکانیان بن.

ئەگەر منداڵێک دوور لە ترس گەورە بووبێ، بەڵام بەو حاڵەش ترسی هێندێک شتی هەبێ، دەبێ هۆیەکەی لە کاتی دوو گیان بوونی دایکی دابدۆزینەوە. گیروگرفتی گەورەی ئێمە بۆ کۆتایی هێنان بەم جۆرە ترسانە، ئاگا نەبوونمان لەو هەل و مەرجەیە کە دایکەکان لە کاتی دووگیانی‌دا تووشی دەبن. چونکە هیچ کەس نازانێ ئایا ژن لە کاتی دووگیانی‌دا، ترس و دڵەخورپەی خۆی رادەگوێزێتە ئەو منداڵەی لە زگی دایە یان نا؟

بەڵام لە بەرامبەردا بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین، منداڵ هەرکە پێ دەنێتە ئەم جیهانە، لەگەڵ ترس ئاشنا دەبێ. ئەو ترسەی دەورروبەر و بنەماڵە دەی بەنە نێو وجوودی منداڵ بریتی‌یە لە: ترس لە شەر، ترس لە

برسیەتی، ترس لە تەنیایی و ترس لە داهاتوو. جۆرێک لە جۆرەکانی ترس کە دایک و بابەکان هەر لە سەرەتای ژیانی منداڵەکانیانەوە بە زیادەوە لە منداڵاندا پێکی دێنن، ترس لە داهاتوویە. دایک و بابەکان بە شێوەیەکی ناسروشتی نیگەرانی داهاتووی منداڵەکانیانن و هەموو ئاکارو کردەوەکانیان سەبارەت بە پەروەردە کردنی منداڵانیان پێوەندیی بەم مەسەلەیەوە هەیە. ئەوان دەبێ بزانن ئەگەر توانای ئەوەیان هەبێ منداڵی سەربەخۆ و ئازاد، پێ بگەیەنن، ئەو منداڵە ئازاد و سەربەخۆیانە لە دوا رۆژدا دەتوانن لەگەڵ گیروگرفتەکان بەربەرەکانی بکەن و بەرەو پێش بچن.

خراپ نیە لێرەدا شتێک وەبیر باوکەکان بێنمەوە: بۆ ئەوەی منداڵەکانتان لێتان بترسێن و حیسێبتان بۆ بکەن، لە ماڵێ قەت خۆتان وەک دێو ودرنج هەڵ مەخەن. کاتێک دایک هەرەشە لە منداڵەکەی دەکا: «راوەستە با بابت بێتەوە تا حەقی خۆت لە مستی بنێ»، منداڵەکەی بە تەواوی لە بابی بێزار دەکا.

سەرەنجام هەوڵ بدەن بە دەردی دەڵێن: لەگەڵ منداڵەکانتان لەسەریەک سەکۆ دانیشن. ئەگەر منداڵەکەتان لێی پرسین: ئەو کاتەی چووکەڵە بووی، لە قوتابخانە چۆن قوتابی‌یەک بووی ؟ راستی‌یەکەی پێ بڵێن. ئەگەر لە مامۆستا دەترسان، یان نومرەی کەمتان وەردەگرت، لێی مەشارنەوە. هەوڵ بدەن خۆتان بێننە ریزی ئەوان تا لەم رێگایەوە رێز و حورمەتتان لێ بنێن. رێز و حورمەتێک کە لە ئۆگری و خۆشەویستی‌یەوە سەرچاوەی گرتوە و دوور لە ترس و وەحشەتە.

پەروەردە کردنی منداڵ بە بێ ترس و گرێانە تا رادەیەک ئاسانە. هیچ وەخت نابێ بی‌ترسێنین یان بە تاوانباری دابنێین. رەنگە نەتوانین هەموو دژکردەوەیەکی ترس لە نێو بەرین، بۆ وێنە کاتێک دەرگا توند پێوە دەدرێ، سروشتی‌یە کە مرۆڤ دەترسێ و رادەچڵەکێ. بەڵام دەتوانین

دژکردەوەی ترسێکی زیانبار کە لە تەمبێ کردن، دەرهەڵبوون و سزادانەوە هاتوە، لە نێو بەرین.

•

## خۆ بەکەم زانین و خەیاڵاوی بوونی منداڵان

هۆی خۆ بەکەم زانین و هەست بە کەمایەسی کردنی منداڵ چی‌یە؟ یەکێک لە هۆیەکان ئەوەیە کە دەبینێ گەورەکان زۆر کاریان بۆ ئەنجام دەدرێن کە ئەو، یان بۆی ناکرێن، یان نایەڵن بیان کا.

لەوانەیە ئەندامی نێرینەش ببێتە هۆی پێک هاتنی هەستی خۆ بە کەمزانین. کوڕە چکۆڵەکان زۆر جار لەبەر بچووک بوونی ئەندامی نێرینەیان بەخۆدا دەشکێنەوە. هەروا کچانی زۆر منداڵیش لەبەر ئەوەی ئەو ئەندامەیان نیە هەست بە کەمایەسی دەکەن. پێم وایە گرنگیی ئەندامی نێرینە وەک نیشانەی دەسەڵات، زۆرتر لە پێوەندی لەگەڵ قەدەغە و قورغە ئەخلاقی‌یەکان (تابوهای اخلاقی) دایە. ئەو بیرە سەرکوتکەرانەی پێوەندی‌یان بە ئەندامی نێرینەوە هەیە لە خەو و خەیاڵی منداڵاندا بە زیادەوە خۆ دەردەخەن. لە داستانەکانیش‌دا شتی وابەرچاو دەکەوێ. لە داستانی علاءالدین و چرای جادوویی‌دا، علاءالدین هەرکات دەست لە «چرا» دەدا، هەموو خۆشی‌یەکانی دنیای لەبەردەمی دەردەکەون. دیارە پیساییش هەر بەم شێوەیە لە خەیاڵاتی منداڵدا بایەخی تایبەتیی هەیە.

ئینسانی خەیاڵاوی لە خەیاڵاتی خۆی‌دا هەمیشە خۆی بە قارەمان دادەنێ و بەسەر هەموو کەند و کۆسپەکان‌دا سەردەکەوێ. گەورەکانیش لەگەڵ خوێندنەوەی رۆمانێک، یان دیتنی فیلمێک یان خواردنەوەی خواردنەوە ئەلکولی‌یەکان و ... دا دەچنە نێو جیهانی خەیاڵ. «رویا» و خەیاڵ پەروەری رێگایەکە بۆ هەڵاتن لەبەر راستی‌یەکان و چوون بۆ دنیایەکی بێ سنوور کە لەوی‌دا هەموو ویست و داخوازەکان جێبەجێ.

دەبن. شێت لە جیهانی خەیاڵیی خۆی نایەتەدەر. دیارە منداڵە ئاسایی و سروشتییەکانیش نوقمی خەیاڵ و «رویا» دەبن. خەیاڵ و «رویا»ی کاتی بە خەبەری لەوانە جوانترن کە شەوانە لە خەودا دەیان بینین. چونکە لەوانەیە خەونی شەوانە ببێ بە مۆتەکە (کابوس)، لە حاڵێکدا خەیاڵی کاتی بەخەبەری هەمیشە پەسند و دڵخوازە.

ماوەیەک پێش ئێستا، کچێکی دە ساڵانەیان ناردە قوتابخانەکەمان کە زۆر ترسنۆک بوو. ئەو هەمیشە لەوە نیگەران بوو کە نەکا لە کاتی خۆیدا نەگاتە سەر کلاس. یەکەم رۆژ کە هاتە سەر کلاس جانتایەکی قورس و گەورەی پڕ لە کتێب و نامیلکەی پێبوو کە لەسەر مێزەکەی بەردەمی دایناو و دەستی کرد بە بەشکردنی ژمارەی ٧٣٠ / ٦٣٢ / ٧٤٥ بەسەر ٩٤/٧٣٩دا. رۆژی دووهەم و سێهەمیش بە «ضرب» و دابەشکردنی هێندێک رەقەمی دیکەوە خەریک بوو و سەعاتەکانی دەرس خوێندنی بەم جۆرە تێپەر کرد. لێم پرسی ئەو جۆرە «ضرب» و دابەشکردنانەت پێ خۆشە؟ بەشەرمەوە گوتی: بەڵێ. رۆژی چوارەم کاتێک سەر لەنوێ دەستی بەو کارە کردەوە لێم پرسی: هەربەراستی حەز لەو کارە دەکەی؟ دەستی کرد بە گریان. بە ئاسپایی کتێبەکانیم پێچایەوە و پێم گوت: «ئێرە قوتابخانەیەکی ئازادە، تۆ ئەو ئازادییەت هەیە هەر کارێکی پێت خۆشە بیکەی». ئەو هاتەوە سەرخۆ و دەستی بە فیتوو لێدان کرد. تەواوی ئەو رۆژەی بە فیتوو لێدان تێپەر کرد.

چەند مانگ دواتر کاتێک لە لێرەوارەکەی نزیک قوتابخانەکەمان خەریکی خلیسکێن بووم دیتم ئەو کچە ئیس.کییەکانی لە پێی کردۆتەوە و بەسەر بەفریدا پیاسە دەکا، لەگەڵ خۆی دەدوێ و لەبەرخۆیەوە پێدەکەنێ. نوقمی جیهانی خەیاڵی خۆی ببوو و خەریک بوو لەگەڵ چەندین شەخسییەت لە شانۆیەک دا یاریی دەکرد. ئەو بە جۆرێک چووبووە نێو جیهانی خەیاڵیی خۆی کە تەنانەت کاتێک بە لایدا

لێپەرێم، هەستی پێ نەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی بانگم کردە ژوورەکەی خۆم و پێم گوت: دوێنێ ئەو قسانەی لە لێوار لەگەڵ خۆت دەدوای، هەموو قسەکانتم گوێ لێ بوو. بەخۆدا شکایەوە و ژوورەکەی بەجێ هێشتم. دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە هاتەوە لام و گوتی: بۆمن زەحمەتە بۆت ڕوون کەمەوە دوێنێ لەچ خەیاڵێک دابووم، بەلام پێموایە پێویستە بۆت بگێڕمەوە».

ئەو لە خەیاڵی خۆیدا دێیەکی چکۆلەی پڕ لە منداڵی هاوتەمەنی خۆی دروست کردبوو. ماڵەکانیان لە چەشنی ماڵە پەریان بوون. بۆ هەر کام لە منداڵانی ئەو دێیە ناوێکی دیاری کردبوو و هەموویانی دەناسین. ئەو قسانەی ڕۆژی پێشتر من لە لێوار بیستبوومن وتووێژی دوو کەس لە دانیشتوانی ئەو گوندە بوون. ئەو منداڵە بەو هۆیەکە تاقانەی ماڵێ بوو و کەس نەبوو کایەی لەگەڵ بکا، چەندین ساڵ لە تەمەنی خۆی بە نوقم بوون لە جیهانی خەیالات‌دا تێپەڕ کردبوو.

بەلام پێم وابوو کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو جیهانە خەیالییەی لێ تێک دەم. چونکە بە زۆری نوقمی ئەو دنیا خەیالییە دەبوو و هیچ کارێکی دیکەی نەدەکرد. هەربۆیە لەبارەی هۆیەکانی ئەو خەیالاوی بوونەیەوە قسەم بۆ کرد و لەڕاستی‌دا جیهانە خەیالییەکەیم لێ ویران کرد. ماوەی دوو ڕۆژان وەک کەسێکی تێک شکاوی لێ هاتبوو و خۆی لە خەڵکی دەشاردەوە. ڕۆژی سێیەم لە حالێکدا بە توندی دەگریا هاتە لام و گوتی: «دوێ شەو دەمەویست سەر لە نوێ گوندە خەیالییەکەم بێنمەوە بەرچاوم بەلام نەمتوانی. گرنگترین و ئازیزترین شتێک کە لەو دنیایەدا هەمبوو ئەتۆ لە دەستت دەرهێنام».

پاش دە ڕۆژان، یەکێک لە مامۆستاکان پێی گوتم: «چ ڕووی داوە؟ ئەو کچە ئەمڕۆ زۆر دەم بە بزە و کەیف خۆشە، هەر نازە نازیەتی و ڕووخساریشی زۆر لە جاران جوانتر بووە». ڕاستی دەکرد کچەکە جوانتر

ببوو و هۆش و زەینی کەوتبووە سەر کاروباری رۆژانە. بەم جۆرە ملی لە خۆشدن نا و بەردەوام خەریکی کار بوو. ئەو پێی نابووە دنیای راستەقینەوە.

یەکێکی دیکە لە قوتابی‌یەکان هەمیشە لە دنیای خەیاڵی خۆیدا دەبووە ئەکتەری شانۆ و بینەران پەیتا پەیتا چەپڵەیان بۆ لێ دەدا.

قوتابی‌یەک لە خەیاڵی خۆی دا هەمیشە دەبوو بە فڕۆکەوان و فڕۆکەکانی دوژمنی بەردەدانەوە.

کوڕێکی چکۆلەش هەبوو ناوی جیم بوو، ئیددیعای دەکرد مامی ماشینێکی «ڕۆلزرۆیس» ی بۆ کڕیوە و بەم زووانە لەگەڵ خۆی دەی‌هێنێتە مەدرەسە. جیم پێی گوتم چونکە ماشینەکەی ئەو لەو ماشینە ئاسایی‌یانە کەمێک گچکەترە بۆ لێخوڕینی پێویستیی بە گەواهینامە (شەهادە)ی لێخوڕین نیە. چەند ڕۆژ دوای ئەو قسانە دیتم ئەوە چەند کەس لە دەستەبراکانی خۆ ئامادە دەکەن لەگەڵ جیم بچنە وێستگەی شەمەندەفەر تا ماشینە خەیاڵی‌یەکە بێننەوە. چونکە جیم پێی گوتبوون مامی ماشینەکەی بە شەمەندەفەر بۆ ناردۆتە وێستگەکەی نزیک گوندەکەمان . ئەمن کەوتبوومە باروودۆخێکی نالەبار، چونکە لە لایەک وێستگەی شەمەندەفەر ٨ کیلومیتر لە قوتابخانەکەمان دوور بوو و نەم‌دەتوانی لێ گەڕێم ئەو مەودا دوور و درێژە بە پێ‌یان بکوتن و لە لایەکی دیکەش پێم خۆش نەبوو کۆشکی خەیاڵی جیم لە پڕ و لە نەکاو برووخێنم و بە هەموان بڵێم قسەکانی جیم لە خەیاڵ بەو لاوە هیچی دیکە نین. هەربۆیە پێم گوتن ئەگەر بچنە ویستگە و درەنگ بێنەوە. چاوتان بە خواردنی نیوەڕۆیە ناکەوێ. جیم کە لە جێ‌یەکی خراپدا گیری کردبوو قسەکەی قۆزتەوە و گوتی: «بەڵێ وایە ئەگەر بچینە ویستگەی شەمەندەفەر، نانی نیوەڕۆیەمان دەچێ». دوای نانی نیوەڕۆیە ڕاهێنەری قوتابخانەکەمان بردنی بۆ سینەما و مەسەلەکە بەم جۆرە کۆتایی هات.

جیم هەر لە ڕۆژی هەوەڵی قوتابخانەکەمانەوە زۆر لەو خەیاڵ پلاوانەی بۆ دۆستانی باس کردبوو. جارێکی دیکەش دەستەیەک لە دۆستانی ئامادە کردبوو لەگەڵ خۆی بیان باتە لەنگەرگەی گوند تا ئەو گەمی یە ماتۆرداره گەورەیەی مامی بۆی ناردبوو، وەزی بگرێ. جیم بەم جۆرە خەیاڵانەی بەسەر خۆ بەکەمزانی و کەمایەسی یەکانیدا زاڵ ببوو و خۆی لە هەڤاڵانی بە گەورەتر دەزانی.

داهێنەرەکان (مخترعین) بەرلە هەر داهێنانێک، لە خەیاڵدا داهێنراو (اختراع)ەکە دەخوڵقێنن. کە وابوو ناکرێ هەر جۆرە خەیاڵ و خەیاڵ پەروەری یەکی مرۆڤ بە خراپ دابنێین. خەون و خەیاڵێک کە بتوانێ وەراست گەڕێ، شتێکی بەجێ یە.

ئەگەر منداڵێک بەردەوام لە دنیای خەیالاتی خۆیدا بژی و نەیەوێ پێ بنێتە جیهانی راستەقینە، دەبێ کۆشکی خەیالاتی لێ بڕمێنین. چونکە ئەم جۆرە خەیالانە بۆ گەشە کردن و پەروەردە بوونی وی زیانیان هەیە. بۆ لە نێو بردنی ئەو خەیالانەی کە ماوەیەکی زۆر منداڵ بە خۆیانەوە خەریک دەکەن، قەت نابێ لە نەکاو و لە ڕێگای توند و تیژی یەوە هەنگاو هەڵێنینەوە. باشترین ڕێگە بۆ ئەم کارە ئەوەیە ڕێگای حاڵی کردنی منداڵ بگرینە بەر تا بەرە بەرە واز لە خەیاڵ پەروەری بێنێ و هۆش و مێشکی خۆی بە مەسەلەکانی دیکەوە خەریک بکا. چونکە هەر منداڵێک پێویستیی بەوە هەیە لە بوارێکدا خۆی لە کەسانی دیکە بە گەورەتر و بەتواناتر بزانێ.

لە کلاسەکانی دەرس خوێندندا بۆ هەست کردن بەو گەورەیی و بەتوانایی یە دوو ڕێگا هەیە: ١. زیرەکتر بوون لە هەموو قوتابی یەک ٢. تەمبەڵتر بوون لە هەموو قوتابی یەک . ئەو منداڵانەی لە پاڵ خۆیان دان ڕێگای دووهەمیان بەدڵترە.

منداڵێک کە لە پاڵ خۆی دایە («درونگرا» یە) بۆ ئەوەی نیشان

بدا لە کەسانی دیکە بەرزتر و بەتواناترە، هەمیشە بەرەو دنیای خەون و خەیاڵ هەڵدەفڕێ. ئەو لە گەڵ کەسانی دیکە دەرناچێ و ناتوانێ وەک وان گۆرانی بڵێ، سەما بکا و لە یاری کردندا وەک وان بێتەوە. بەلام لە دنیای خەیاڵیی خۆیدا، قارەمانی هەموو کێبەرکێیەکانە و هەمیشەش سەرکەوتوویە. بۆ هەر ئینسانێک رازی کردنی «خۆ» پێویستییەکی گرنگە و ناکرێ ئەو مەسەلەیەی وەک کەم و کووڕی بۆ بێنینە حیسێب.

## هۆیەکانی شکاندن و لەکارخستنی کەل و پەل لەلایەن منداڵانەوە

گەورەکان بە زەحمەت هەست بەوە دەکەن کە منداڵان رێزێک بۆ مڵکداری (مالکیت) دانانێن. ئەوان بێ ئەوەی هیچ مەبەستێکی تایبەتییان هەبێ و بێ ئەوەی بەخۆ بزانن، ئامراز و کەل و پەلەکان دەشکێنن.

جارێک چاوم بە کچێکی تەواو ساغ و سەلیم و ئاسایی کەوت کە خەریکی کون کردنی مانتۆکەی خۆی بوو. کاتێک بانگم کرد، تێک رابوو و گوتی: هیچ ئاگام لێ نەبووە چ دەکەم. راستی دەکرد کارەکەی وی مەبەستێکی تێدانەبوو.

راستییەکەی ئەوەیە شتوومەک لە لای گەورەکان بایەخێکی زۆری هەیە. بەلام منداڵان بایەخێکی ئەوتۆی پێ نادەن و زۆربەی گیروگرفتەکانیش لەوە را پێک دێن. لە قوتابخانە، قوتابییەکان ماوەیەکی زۆر بە خۆرایی گڵۆپەکان دایسێنن و پێوەندییەک لە نێوان ئەو کارە و پووڵی بەرق (کارەبا)دا کە من دەبێ سەری مانگ بیدەم نابینن. مۆبلیمان و کەل و پەلی نێو ماڵ بە کردەوە لای منداڵ بایەخێکی ئەوتۆیان نیە. هەربۆیەشە ئێمە بۆ قوتابخانەکەمان کورسیی پاسەکۆنەکان دەکڕینەوە تا ئەوەندە نیگەرانی شکاندنیان نەبین. جەنگەی نانی نیوەڕۆیە، ئەگەر خواردنەکە کەمێک درەنگتر بگاتە سەر مێز لەوانەیە

قوتابی‌یەک چەنگاڵەکەی بە ددانان خێچ و خوار بکا و کەلکی لێ ببڕێ. زۆربەی ئەم جۆرە کردەوانە لە خۆوەن. منداڵان هەر لە ئاست کەل و پەلی کەسانی دیکە کەمتەر خەم نین بەڵکوو هێندێک جار لە ئاست هی خۆشیان کەمتەر خەمن. بۆ وێنە لە بیریان دەچێ دووچەرخە نوێ‌یەکانیان کە زۆریش لایان خۆشەویستن، لەبەر بارانێ لابەرن و بیان هێننە شوێنێکی سەرداپۆشراو.

ناکرێ شکاندن ولە کارخستنی کەل و پەل لە لایەن منداڵانی هەشت نۆ دە ساڵەوە بە دژایەتی لەگەڵ کۆمەڵ دابنێین. چونکە ئەوان لەو تەمەنەدا هێشتا مانای مڵکداریی شەخسی‌یان بۆ دەرنەکەوتوە. کاتێک خەریکی یاری کردن دەبن، بۆ دروست کردنی خانوو یان ئاڵا لە پەتوو و مەلافەش کەلک وەردەگرن. بەڵام پاش تێپەرکردنی ئەو قۆناغەی تەمەن و چوونە نێو قۆناغی مێرمنداڵی بایەخی شتوومەکیان بۆ دەردەکەوێ.

کچان کەمتر لە کوڕان کەل و پەل دەشکێنن و لە کەلک دەخەن. ڕەنگە هۆیەکەی ئەوە بێ کە ئەوان کایە ۆ یاریی ئارامیان پێ خۆشە و کەیفیان بە یاریی لاسایی کردنەوەی کانگێستەرەکان نایە. بەو حاڵەش بۆ ئەوەی غەدرم لە کورەکان نەکردبێ دەبێ بڵێم لە قوتابخانەکەمان‌دا ژووری کچەکانیش هەروەک ژووری کورەکان شپڕێو و نارێک و پێکە. کاتێک هۆی ئەو شپڕێوی و ئاڵۆزی‌یەیان لێ دەپرسم هەمیشە لە وەڵام‌دا دەڵێن کوڕەکان شاڵاویان بۆ ژوورەکەیان هێناوە و شپڕێویان کردوە. کە دیارە ئەو وەڵامە ناتوانێ ڕازیم بکا.

چەند ساڵ لەمەوبەر دیوارەکانی ژووری خەوی قوتابی‌یەکانمان بە کاغەز دیواریی ئەستوور داپۆشی تا هەم ژوورەکە برازێتەوە و هەم سەرما بە قەڵشتی دیوارەکان‌دا نەیەتە ژوور. ئەو جۆرە کاغەز دیواری‌یە کە لە مقەبا بوو و نەرم بوو، بە جۆرێک سەرنجی منداڵەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا کە هەموویان بە تیغ و شتی نووک تیژ بەر بوونە گیانی و کون

کـونیـان کـرد. ئەم کـارەش هەروەک دەست لە کـونەلووت وەردان کردەوەیەکی لە خۆوەیە و هاندەر (محرک) ێکی شاراوەی هەیە. لەوانەیە کورێکی چکۆلە، بزمارێک بکا بە دەستە جلەوی بەلەمە بچووکەکەی بەلاّم ئەگەر بزماری لەبەر دەستان نەبێ بێ سی و دوو کردن یەکێک لە کەل و پەلە کانزایی (فلزی)یە بە نرخەکانی من هەلْ دەگرێ و بۆ ئەم مەبەستە بە کاری دێنێ.

ئاکار و کردەوەی منداڵ لە چەشنی ئاکاری ئینسانە سەرەتاییەکانە. بۆیە پێویستە شوێنێکیان بۆ دیاری بکرێ تا هەر کارێک پێیان خۆشە لەوێ بیکەن. لە قوتابخانە بۆ ئەوەی قوتابیان زیانی زۆر بە ژوورەکان نەگەیەنن ناچار بووین دوو واگۆنی شەمەندەفەرێکی لە کەلک کەوتوو بکڕین و بە قوتابییەکان بلێین ئەو واگۆنانە بکەنە ژووری کار و چۆنتان پێ باشە وایان بپارێزن. ئێستا سی و سێ ساڵ لەو رووداوە رادەبرێ و لەگەڵ ئەوەشدا قوتابییەکان واگۆنەکانیان نەپاراستوە و دیوارەکانیان بە چەقۆ و شتی دیکە کون کردوە، هێشتا کەلکیان پێوە ماوە.

جێی داخ ئەوەیە کە ئێمە گەورەکان بۆ کەل و پەل بایەخی زیاتر دادەنێین تا بۆ منداڵاْن. ئێمە ئەوەندەمان دڵ بە مۆبیلْ و کورسی و جل و بەرگ و کەل و پەلی دیکەوە هەیە کە وەختێک منداڵ ئاگای لێیان نابێ توورە دەبین. زۆر جار ئەم جۆرە شتانە لە منداڵاْن خۆشەویستترن ، جا چونکە داخوازەکانی منداڵاْن و گەورەکان لێک جیاوازن، کێشە و هەڵلا دروست دەبێ.

جارێک سێ کوڕی چکۆلە چرا دەستییەکەمیان کە بە پوولێکی زۆرم کڕیبوو بە ئەمانەت لێ وەرگرتم. پاش تاوێک بۆم دەرکەوت کە ئەوان بۆ ئەوەی دیوی نێوەوەی چرایەکە ببینن، لەبەر یەکیان هەڵوەشاندوە و شکاندوویانە. بۆم لە گەڕانەوە نایە کە ئەو مەسەلەیە چەندی توورە کردم. بەلاّم کارەکەی وان یانی هەوڵدان بۆ دیتنی دیوی نێوەوەی چرا

دەستی‌یەکە لە باری دەروونناسی‌یەوە مانایەکی تایبەتیی هەبوو کە من ناچار بووم بە هێندی بگرم و گیروگرفتەکەیان تێ بگەم.

زۆر لە دایک و بابەکان لێم دەپرسن ئەگەر منداڵێک مێز و پیانۆکەت بە بزمار کون بکا، دژکردەوەت چ دەبێ؟ یان ئەگەر ئەوان لە جێی من بن دەبێ چ بکەن؟ لە وەڵامیان دا دەڵێم دژ کردەوەی ئێوە زۆر گرنگ نیە. گرنگ ئەوەیە بە چ شێوەیەک لەگەڵی دەجووڵێنەوە. ئەگەر پێی بڵێن ئەو مێز و پیانۆیە هی ئێمەیە و تۆ مافی ئەوەت نیە خراپی بکەی و بە کورتی لەو جۆرە کارانەی بگێڕنەوە، کارێکی خراپتان نەکردوە. بەڵام ئەگەر بتانەوێ لەباری ئەخلاقی‌یەوە دادگایی بکەن و پێی بڵێن تۆ منداڵێکی بەدفەر و بزۆز و دەست بە زەڕ و ناجسنی، زەبرتان لێ داوە. نابێ سەبارەت بە هەڵەیەک شەخسییەتی منداڵ بە گشتی بخرێتە ژێر پرسیار، بەڵکوو دەبێ حاڵی بکرێ کە ئەو، بەم جۆرە کارانەی زیان بە کسانی دیکە دەگەیەنێ.

لە کار خستن و شکاندنی کەل و پەل لە لایەن ئەو منداڵانەوە کە لە روانگەی دەروونناسی‌یەوە ناتەواون، لەگەڵ شکاندنی کەل و پەل لە لایەن منداڵە ئاسایی‌یەکانەوە، جیاوازیی هەیە. ئەم جۆرە کردەوانەی منداڵە ئاسایی‌یەکان، لە ڕق و نیگەرانی‌یەوە سەرچاوە دەگرن. بەڵام کەل و پەل شکاندنی منداڵە ئاسایی‌یەکان دەگەڕێتەوە بۆ داهێنەریی ئەوان و هەوڵدانیان بۆ سەرەدەرکردن لە دیوی ژوورەوەی کەل و پەلەکان و هیچ پێوەندی‌یەکی بە بەدفەری و ئاڵۆزیی دەروونی‌یەوە نیە.

تێکدەریی راستەقینە ئەو کاتەیە کە وێران کردن و تێکدان تێکەل بە رق بێ. ئەم جۆرە کارە، سەمبولی کوشتار و قەلاچۆیە و تەنیا منداڵە ناتاسایی‌یەکان ناگرێتەوە. ئەوانەی شەڕ و بۆمبارانیان دیوە لەو جۆرە وێرانکاری‌یانە کە سەربازانی دوژمن بەرێوەی دەبەن شارەزان.

داهێنان یانی ژیان و وێرانکاری یانی مەرگ. منداڵی تێکدەر ژیانی

خـۆش ناوێ. کـردەوەی وێرانکارانە و تێکدەرانەی منداڵە بیـر ئاڵۆز و نیگەرانەکان ڕەنگە هۆی جۆربەجۆری هەبێ. یەکێک لە هۆیەکان ئێرەیی بردنی منداڵ بە خوشک یان براکەیەتی کە پێی وایە دایک و بابەکەی، ئەویان بە قەرا وان خۆش ناوێ. هۆیەکی دیکەش سەردانەنواندنی منداڵ بەرامبەر بە دەسەلاتی سەرکوتکەرانەی دایک و بابیەتی. لەوانەشە منداڵ بە مەبەستی سەرەدەر کردن لە چۆنیەتیی کار کردنی کەل و پەلەکان پەنا بەرێتە بەر شکاندن و لە کەلک خستنیان.

درۆزنــــــی

ئەگەر منداڵەکەتان فێرە درۆ بووە هۆیەکی ئەوەیە یان دەترسێ، یان ئەوەتا لاسای ئێوە دەکاتەوە. هەر لە جێدا دایک و بابی درۆزن، منداڵی درۆزنیـان دەبێ. ئەگەر دەتانەوێ منداڵەکەتان قەت لە ڕاستی لا نەدا، درۆی لەگەڵ مەکەن. مەبەستی من ئەوە نیە دەرسی ئەخلاقتان پێ بڵێم. چونکە هەمورمان جارو بارە ناچار دەبێ درۆیە بکەین.

هێندێک جار دایک و بابەکان بۆیە درۆیان دەکەن تا منداڵەکانیان ڕێزی زۆرتریان لێ بنێن. بۆ وێنە کاتێک کوڕێک لە بابی دەپرسێ: ئەری بابە تۆ دەتوانی لەگەڵ ٦ کەسان زۆرەوانی بگری و هەموانیش لە عەرزی دەی؟ بەراستی ئازایەتی‌یەکی زۆری پێویستە کە بڵێین : ڕۆڵە گیان من بەو قەد و گیپاڵەمەوە نەک شەش کەس دەرەقەتی نیمچە پیاوێکیش نایەم.

کـەم کـەس لە ئێمـە هەیە ئەو ئازایەتی‌یەـان هەبێ بە منداڵان و قوتابی‌یەکانمان بڵێین ئێمەش زۆر جاران لە هەورە تریشقە یان لە دیتنی پۆلیس دەترسێین! یان بڵێـین ئێمـەش کـە منداڵ بووین لە قـوتابخـانە نومـرەی کـەممان دێنایەوە یان منداڵانی دیکە لێیان دەداین. دایک و بابەکان هەمیشە هەوڵ دەدەن خۆیان وەک ئینسانێکی بێ کەم و کووڕی

بە منداڵەکانیان بناسێنن.

وەبیرم دێ ئەو کاتەی منداڵێکی چکۆڵە بووم بابم لە ترسی گایەک لە دیواری باغێک را خۆی فڕێ دا و رای کرد. من کە ئەو رووداوەم بەچاوی خۆم دیت بە تەواوی سەرم سوڕمابوو و باوەڕم نەدەکرد بابم ئەوەندە بترسێ و پێم وابوو چاوم رەشکەو پێشکەی کردوە. لە مێشک و خەیاڵی منداڵاندا ئێمە گەورەکان لەو قارەمانانەین کە هەرگیز تووشی شکان نابین. بۆ خۆشمان هەوڵ دەدەین خۆمان وەک ئەو قارەمانانە بە منداڵانمان بناسێنین. بەڵام راستی‌یەکە سەرئەنجام رۆژێک ئاشکرا دەبێ و منداڵان لێیان روون دەبێتەوە کە دایک و بابەکانیان و مامۆستاکانیان درۆیان لەگەڵ کردوون و ئەوانیان هەڵفریواندوە.

بەتایبەتی و نەمسانەوێ منداڵان لە تەمەنێکی تایبەت لە قۆناغی مێرمنداڵی‌دا دەست دەکەن بە رەخنە گرتن لە دایک و بابەکانیان و هەست بەوە دەکەن کە بیروبۆچوونەکانی ئەوان کۆن بوون و بایەخیان نەماوە. ئەم قۆناغە راست ئەو کاتەیە کە مێرمنداڵ تایبەتمەندی‌یەکانی دایک و بابی بۆ دەردەکەوێ و تێ دەگا کە ئەوانیش وەک کەسانی دیکە هەڵە و ناتەواوی و کەم و کووڕی‌یان هەیە. هەستی بەکەم دانانی دایک و باب کە مێرمنداڵ لەو تەمەنەدا تووشی دەبێ، لە ئاشکرا بوونی شەخسیەتی راستەقینەی دایک و بابیەوە سەرچاوە دەگرێ. مێرمنداڵ بۆی دەردەکەوێ ئەو شەخسیەتە خەیاڵی‌یەی ئەو لە مێشکی خۆی دا لە دایک و بابی دروستی کردبوو، بناخەی نیە. جیاوازیی نێوان ئەو شەخسیەتە خەیاڵی‌یەی دایک و باب کە لە مێشکی وی‌دا هەبووە. ـقارەمانانێک کە هەرگیز تووشی شکان نابن ـ ودایک و بابی راستەقینە کە ئێستا لە بەرامبەر خۆی‌دا دەیان بینێ، ئەوەندە زۆرە کە ناچاری دەکا ماوەیەکی زۆر تێیان هەڵپێچێ و رەخنەیان لێ بگرێ. ئەم وەزعە ماوەیەک درێژە دەکێشێ و سەرئەنجام مێرمنداڵ سەرلەنوێ رێگای هاودەردی و سازان

لەگەڵ دایک و بابی دەگرێتەوە بەر. بەڵام ناسیاویی لەمەو دوای مێرمنداڵ لەسەر دایک و بابی هەموو تەم و گومانێکی لێ سڕاوەتەوە و مێرمنداڵ لێرە بەدواوە لەگەڵ دایک و بابی راستەقینە لە پێوەندی دایە. پرسیار ئەوەیە بۆ دەبێ منداڵەکانمان تووشی ئەم جۆرە تێگەیشتنە چەوتانە بکەین؟ ئەگەر ئێمە دایک و بابەکان هەوڵ بدەین بەو جۆرە کە هەین خۆمان بە منداڵەکانمان بناسێنین، رەنگە ئەو تێگەیشتنە چەوتانە قەت پێک نەیەن.

یەکێک لە گیروگرفتە گرنگەکانی سەررێگای گوتنی حەقیقەت ئەوەیە کە ئێمە لەگەڵ خۆشمان راست نین و لەگەڵ خۆشمان و خەڵکیش درۆ دەکەین. ئێمە وا راهێنراوین بۆ ئەوەی بگەینە پلەیەکی تایبەتی لە «اخلاقیات» ـ کە روون نیە چیە ـ درۆیان بکەین.

ئەو گەورانەی ـتەنانەت بە شێوەی ناراستەوخۆ ـ لەگەڵ منداڵان درۆ دەکەن، لە منداڵان حاڵی نین و تێیان نەگەیشتوون. بەداخەوە تەنانەت لە نیزامەکانی فێرکردنیش‌دا بۆ هان دانی منداڵان لە خوێندن‌دا، لە درۆی جۆربەجۆر کەلک وەردەگیرێ. کاتێک بە منداڵان دەگوترێ: فێربوونی مێژوو و زمانی بێگانە یەکێک لە پێویستی‌یەکانی پەروەردە و فێرکردنێکی سەرکەوتوویە و گوێ ڕایەڵی و خۆش خزمەتی لە خوو و خدە باشەکانی ئەخلاقە، داخوا راستی‌یەکەمان پێ گوتوون؟ داخوا بەراستی فێر بوونی مێژوو یان «جبر» لە پێویستی‌یەکانی هەر کارێکە؟ ئاخۆ گوێ ڕایەڵ بوون لە بەرامبەر گەورەکان‌دا لە نەریتە بەرزەکانی ئەخلاقە؟

لە نێو قوتابیانی قوتابخانەی ئێمە دا درۆزنی حیرفەیی یان درۆزنی لە چار نەهاتوو، بەرچاو ناکەوێ. ژمارەیەک لە قوتابیان لە رۆژەکانی هەوەڵی هاتنیان بۆ قوتابخانەدا جاروبارە پەنا دەبەنە بەر درۆ کردن و هۆیەکەشی ترسان لە سزا و تەنبێ‌یە. بەڵام کە وردە وردە بۆیان دەردەکەوێ لەم قوتابخانەیەدا کەس نیە ئەوان سزا بدا و تەنبێ‌یان بکا، ترسیان دەشکێ و پێویستی‌یەک بە درۆ کردن نابینن. ئەوەی منداڵان

بەرەو درۆ کردن پاڵ پێوە دەنێ، زۆرتر ترسان لە سزا و تەنبێیە. ئەگەر لە سزا ترسان لە گۆڕێ دانەبێ، منداڵان زۆر بەکەمی پەنا دەبەنە بەر درۆ کردن. دیارە ناکرێ بڵێین ئەگەر ترس لە سزا نەمێنێ، درۆ کردنیش بە تەواوی بنەبڕ دەبێ. بەڵام راستییەکەی، درۆ کردن لە کەمی دەدا. کوڕێک کە شووشەی پەنجەرەی قوتابخانەی شکاندوە، لە وانەیە بۆ خۆی بێتە لام و راستییەکەم پێ بڵێ. بەڵام هەر ئەو کورە ئەگەر بێ پرس کردن خواردەمەنییەکی نێو یەخچاڵی قوتابخانەکەمان بخوا، یا چەکوچ، هاچەر و ئامرازێکی دیکە هەڵ بگرێ و نەزانێ لە کوێی داناوە، ئەگەر پرسیاری لێ بکەم ئەتۆ شتی خواردنت لە یەخچاڵەکە دەرهێناوە؟ یان چت لە هاچەر و چەکوچ کردوە؟ بە درۆ وەڵامم دەداتەوە و حاشا لەو کارانەی دەکا. ئەگەر لە منداڵانمان بوێ لە ژیانیاندا هیچ کات درۆیان نەکەن، رەنگە ئەو داوایەمان جێبەجێ نەبێ. تەنانەت ئەو منداڵانەش کە دوور لە ترس و لە هەل و مەرجێکی ئازاد دا پەروەردە دەبن، جاروبارە هێندێک درۆی خەیاڵی دەکەن. زۆر جاران دایک و باوەکان کێچێک دەکەنە گایەک. کاتێک منداڵێکی چکۆڵەی وەک جیمی پێم دەڵێ: باوکی ماشێنێکی «رولزرۆیس»ی بۆ کڕیوە تا ئەو لێی خوڕێ، من لە وەڵامی دا دەڵێم: «دەزانم بۆ خۆم لەکن دەرگا دیتم، بەراستی ماشێنێکی جوانە»، وەختێک لەگەڵ دژکردەوەیەکی ئەوتۆ بەرەوروو دەبێ لە وەڵامدا دەڵێ: «چاکە! بۆ خۆشت دەزای کە من بە گاڵتەمە».

رەنگە زۆر کەس لە نێوان درۆزنی و ساختە چێتی و دەغەڵکاریدا، جیاوازییەکی گەورە بەدی نەکەن. بەڵام لە روانگەی منەوە درۆزن و ساختەچی (متقلب) لە زۆر بارەوە جیاوازییان هەیە. لەوانەیە ئێوە لە خەتە ئەسڵییەکانی ژیانتاندا راست و دروست بن. بەڵام سەبارەت بە شتی چووکە و کەم نرخ توشی هێندێک درۆیان بن. ئێمە زۆرتر بۆ ئەوەی کەسانی دیکە لێمان دڵ ئێش نەبن درۆیان دەکەین. بۆ وێنە ئەمن کاتێک

نامەیەکی دوور و درێژم بۆ دێ کە هیچ بە دڵم نیە، هەر بە بیریشمدا نایە لە وەڵامی‌دا بنووسمەوە: «دۆستی بەرێزم نامەکەت ئەوەندە دوور و درێژ و بی تام بوو کە نەمتوانی تاسەر بیخوێنمەوە». یان کاتێک دەکەومە تەنیشت کەسێک کە ئیددیعا دەکا موسیقازانە بەڵام بە زەحمەت سازێکی بۆ لێ دەدرێ، ناتوانم پێی بڵێم ساز لێ دانەکەت ئابڕوو بەرەیە! درۆ کردنی گەورەکان لەم جۆرە کاتانەدا دەگەڕێتەوە بۆ لەروو دامان و درۆ کردنی منداڵانیش لە هۆی شەخسی و خۆپەرستی‌یەوە سەرچاوە دەگرێ. شتێک کە دەبێتە هۆی ئەوەی منداڵ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی‌دا درۆزن بێ ئەوەیە کە لێمان بوێ قەت درۆیان نەکا و هەمیشە راستی بڵێ.

ئەوەم قەبووڵە کە گوتنی راستی‌یەکان بە منداڵان کارێکی هاسان نیە. بەڵام ئەگەر بڕیار بدەین کە درۆ لەگەڵ منداڵانمان نەکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوە، کارێکی زۆر بە زەحمەتیش نیە. تەنیا ئەو کاتانە دەبێ پەنابەرینە بە درۆ کردن کە ژیانی کەسێک لە مەترسی دایە. بۆ وێنە کاتێک منداڵێک نەخۆشە، ئەگەر بابی ڕووداوێکی دڵتەزێنی بەسەر هاتوە نابێ ئەو خەبەرەی پێ بدەین.

نزیک بە تەواوی رێ و شوێنەکانی تێکەڵاوی (آداب معاشرت) و سەرو زمان خۆشی لەگەڵ جۆرێک درۆ کردن تێکەڵن. زۆر جاران کە لەگەڵ کەسێک بە سەروزمان خۆشی دەجووڵێینەوە یان سوپاسی دەکەین لە قووڵایی دڵمان دا باوەڕمان بەو قسانە نیە کە دەیان کەین و لەبەر هۆی تایبەتی‌یە کە ئەم جۆرە کارانە دەکەین.

درۆ کردن رەنگە عەیبێکی چووکە بێ بەڵام ژیانی بە درۆ، بەدبەختی و چارەرەشی‌یەکی گەورەیە. ئەو ژن و مێردانەی پێوەندیی ژن و مێردایەتی‌یان لەسەر بناخەی درۆ دامەزراوە، بۆ منداڵەکانیان نموونەیەکی زۆر خراپن. بابێک کە وەزعێکی باشیشی هەبوو رۆژێک هاتە لام گلەیی

لە کوڕە ١٦ ساڵانەکەی هەبوو کە زۆر جار دزیی دەکرد. ئەو بابە دەی‌گوت: ئەمن هەر لە سەرەتاوە لە کوڕەکەم ویستوە قەت درۆم لەگەڵ نەکا و لە ماڵی‌دا لە گەڵمان راست بێ. دایک و بابی ئەو کوڕە نەک هەر یەکتریان خۆش نەدەویست بەڵکوو لێک بێزار بوون. وادیار بووە ئەو لێک بێزار بوونەیان لە خەڵکی شاردۆتەوە و «گیانەکەم» و «دەبەرت مرم» و وشەی لەم چەشنەیان پێکتر گوتوە. کوڕەکەیان بە تەواوی هەستی بەوە کردوە کە پێوەندیی دایک و بابی لەسەر درۆ دامەزراوە و دایک و بابی ژیانێکی تێکەڵ بە درۆیان هەیە و بۆ ئەوەی سەرنجی ئەوان بۆ لای خۆی راکێشێ پەنای بۆ هێندێک دزیی بچووک بردوە. لە بنەماڵەیەک‌دا کە بناغەکەی لەسەر درۆ دامەزراوە چلۆن دەکرێ منداڵێک پەروەردە بکەین کە لە هەر بارێکەوە بێ عەیب و کەم و کووڕی بێ؟ بۆ منداڵانی ئەو جۆرە بنەماڵانە دزی کردن رێگایەکی کاریگەری وەدەست هێنانی ئەو «محبت» و خۆشەویستی‌یەیە کە لە ماڵی‌دا دەست ناکەوێ.

منداڵێک لە وانەیە بۆ ئەوەی لاسای دایک و بابی کردبێتەوە درۆیان بکا. منداڵێک کە دایک و بابی لەگەڵ یەک ناگونجێن و یەکتریان خۆش ناوێ، ناتوانێ هەموو کات راست وێژ بێ. چونکە دایک و بابەکەی بۆ ئەوەی منداڵەکەیان لە نێوان ناخۆشیی ئەوان تێ نەگا، ناچارن رواڵەتێکی درۆ و ناراست بە هەڵس و کەوت و پێوەندیی خۆیان بدەن. بەڵام منداڵەکە سەرەنجام هەست بەو مەسەلەیە دەکا و لەو رەفتارە بە درۆیە کە لە پێش چاوی وی لە خۆیانی نیشان دەدەن تێ دەگا. لەو جۆرە کاتانەدا منداڵ پەنا دەباتەوە بەر جیهانە خەیاڵی‌یەکەی خۆی. لە بیرتان نەچێ منداڵان زۆر شت هەیە کە تێی ناگەن بەڵام هەستی پێ دەکەن.

لە کۆمەڵێک‌دا کە هەموو شتێک تێکەڵ بە درۆیە، دووری کردن لە درۆ، بۆ دایک و بابەکان کارێکی بەزەحمەتە. بەڵام ئەوان دەبێ باش بزانن کە هێندێک درۆ زۆر زیانی قەرەبوو نەکراو بە منداڵانیان

دەگەیەنن. کاتێک دایک و بابێک بە منداڵەکانیان دەڵێن دەستپەڕ (استمناء) سەرەنجام دەبێتە هۆی شێت بوون، نازانن کە بەو درۆیەیان چ زەبرێکی گەورەیان لە منداڵی خۆیان داوە.

من دڵنیام کە دایک و بابەکان پێویستی‌یەکیان بەوە نیە درۆ لەگەڵ منداڵانیان بکەن. ئەوان نابێ ڕێگە بە خۆیان بدەن درۆ لەگەڵ منداڵانیان بکەن. کەم نین ئەو بنەماڵانەی ئەندامەکانیان قەت درۆ لەگەڵ یەکتر ناکەن و منداڵی ڕاست وێژیشیان تێدا پەروەردە دەبێ. دایک و بابەکان دەبێ وەڵامی ڕاست بە پرسیاری منداڵەکانیان بدەنەوە. جا ئەو پرسیارە پێوەندی بە سەرچاوەی ژیانەوە هەبێ، یان چۆنیەتیی پەیدا بوون و لە دایک بوونی منداڵ، یان تەمەنی دایک و باب و ڕابردووی ئەوان.

لە سی ساڵی ڕابردوودا کە بەرپرسایەتیی ئەو قوتابخانەیەم لەسەر شان بووە، هەرگیز بە ئەنقەست درۆم نەکردوە و قەتیش نەمویستوە ئەو کارە بکەم. دیارە تاقە جارێک ناچار بووم درۆیەکی گەورە بکەم. مەسەلەکە بەم جۆرە بوو یەکێک لە کچانی قوتابی کە من ئاگاداری گیروگرفت و پێوەندی‌یەکانی ئەو لەگەڵ دایک و بابی بووم، ڕۆژێک نازانم لە کوێی قوتابخانەکەمان پاوندێکی دزیبوو. هەروەک دەزانن لە وەختی ئاوادا لە قوتابخانەکەی ئێمە قوتابی‌یەکان بۆ خۆیان لە چۆنیەتیی ڕووداوەکە دەکۆڵنەوە. هەر بۆیە سێ کەس لە قوتابی‌یەکان کە بەرپرسایەتیی لێکۆڵینەوە لەو ڕووداوەیان پێ سپێردرابوو، لەو کچەیان پرسیبوو ئەو پوولەت لە کوێ هێناوە؟ لە وەڵامدا گوتبووی ئاغای نیل ئەو پوولەی داومەتێ. ئەوان قوتابی‌یەکیان ناردە لای من تا بزانن ڕاستە کە من ئەو پوولەم داوەتێ؟ دەست بەجێ ئەو وەزعەم هێنایە بەرچاوی خۆم کە کچەکە تێی کەوتبوو. هەر بۆیە بە دڵنیایی‌یەوە گوتم: بەڵێ بەڵێ ئەو پوولە من داومەتێ. بەم جۆرە تووشی درۆیەکی گەورە بووم، چونکە ئەگەر ڕاستی‌یەکەم گوتبا ئەو کچە ئیدی هەتا هەتایە متمانەی پێ نەدەکردم و

ئەمنی چی‌دیکە بە لایەنگری خۆی نەدەزانی. ئەو دزی‌یە چووکەیە زۆرتر نیشانەی نەبوونی خۆشەویستی بوو تا پەیدا کردنی پووڵ. کچەکە بەم کارەی دەی‌ویست خۆشەویستی و سەرنجی کەسانی دیکە بۆ لای خۆی راکێشێ. منیش دەبوایە پێم نیشان دابا کە لاگری ئەوم و ئاگام لە دەردەکەی هەیە. ئەگەر ئەو کچە لە بنەماڵەیەکی ئازاد و راست‌وێژدا گەورە بووبایە، رەنگە قەت تووشی ئەو کارە نەبوایە. کەوابوو هۆی درۆ کردنی من تەنیا و تەنیا ئامانجی دەرمانیی هەبوو و ج جاری دیکە رێ نەکەوتوە درۆ بکەم.

ئەگەر منداڵان بە ئازادی گەورە بن و ترسێکیان لە گەوران نەبێ پێویستی‌یەکیان بە درۆ کردن نامێنێ. رۆژێک ژاندارمی ئاوایی‌یەکەمان بۆ دیتنی من هاتبووە قوتابخانە. ئێمە لە دەفتەری قوتابخانە خەریکی قسە و باس بووین کە یەکێک لە قوتابی‌یەکان وەژوور کەوت و گوتی: نیل! چەند دەقیقە لەمەوبەر لە کاتی تۆپ تۆپێن‌دا شووشەی پەنجەرەی ساڵۆنم شکاند. ژاندارمەکە لەو کارەی قوتابی‌یەکە بە تەواوی سەری سوڕما و پێی سەیر بوو منداڵێک ئاوا هاسان دان بە تاوانی خۆی دابنێ. درۆ کردنی منداڵان زۆرتر بە مەبەستی خۆ پەڕاندنەوەیە. درۆزنی لەو بنەماڵانەدا باش سەر هەڵ دەدا کە ترس بەسەریان‌دا زاڵە. ئەگەر دەتانەوێ کۆتایی بە درۆزنی بێ، ترس خاشەبڕ کەن.

جۆرێکی دیکە لە درۆزنی هەیە کە ئاکامی ترس نیە و لە خەیاڵاوی بوونەوە سەرچاوە دەگرێ. کاتێک منداڵێک بە دایکی دەڵێ: دایە ئەمڕۆ سەگێکم دیت بە قەرا گایەک دەبوو، ئەوە ناکرێ بە درۆزنی بزانین. درۆیەکە خوڵقاوی خەیاڵە و زۆرجار ماسیگر و راوچی‌یە ناشارەزاکانیش کاتێک دەچنە راوەماسی و ... زۆر خەیاڵی ئەوتۆ لە بارەی ئەو ماسی و نێچیرانەوە کە لە دەستیان دەرچوون، بە داستان دەگێڕنەوە.

کەسانێک کە ئەو جۆرە درۆیانە دەکەن دەیانەوێ شەخسیەتێکی بە

هێز و گرنگ لە خۆیان نیشان بدەن. باشترین دژکردەوە بەرامبەر بەو منداڵانە کە ئەم جۆرە درۆیانە دەکەن، ئەوەیە خۆت تێکەڵی یاری یەکەیان بکەی. هەربۆیە کاتێک «بیلی»یە بچکۆلەکەمان بە من دەڵێ بابم فڕۆکەیەکی هەیە، منیش لە وەڵامی‌دا دەڵێم دەزانم و لێی دەپرسم داخوا ئەویش دەتوانێ لێی خوڕێ؟ هەروەک لەپێش‌دا گوتم، ئەم جۆرە درۆیانە زۆرتر ئەو منداڵانە دەیان کەن کە خۆ کەم بینن و بەم جۆرە دەیانەوێ خۆیان گرنگتر و گەورەتر بنوێنن. گەلێک جار لە خۆم دەپرسم ئەگەر منداڵێک هەر لە سەرەتای ژیانیەوە لە موحیتێکی سەربەخۆ، ئازاد و دوور لە ترس‌دا گەورە بێ، داخوا ئەویش لەم درۆ خەیاڵی‌یانە دەکا؟ رەنگە هەر لە بنەرەتەوە هەست بە خۆ کەم‌بینی نەکا تا بیەوێ بە فەروفیشاڵ و ئەوجۆرە رووداوە خەیاڵی‌یانە، کەمایەسی‌یەکانی خۆی قەرەبوو بکاتەوە.

ئەوانەش کە منداڵی کەسانی دیکە بە منداڵی خۆیان قبووڵ دەکەن دەبێ هەرچی زووتر حەقیقەتەکە لەگەڵ منداڵی ژێرسەرپەرستیی خۆیان بێننە گۆڕێ. ئەو دایک و بابانەی هەوڵ دەدەن منداڵی وەرگیراو (ئەمانەتی) ی خۆیان وا تێ‌بگەیەنن کە ئەو منداڵی راستەقینەی ئەوانە، بۆ خۆ دەرباز کردن لەو گیروگرفتانەی زۆر جاران تووشیان دەبن ئەو کارە دەکەن. لە ماوەی ژیانم‌دا زۆرجار لەو منداڵانەم دیون کە گیروگرفت و ئاڵۆزیی رووحی و دەروونیی جۆربەجۆریان هەبووە. دیارە حەقیقەت تاهەتایە ناشاردرێتەوە و سەرەنجام لە نێو هاڤاڵانی ئەو جۆرە منداڵانەدا، یەکێک هەر هەڵ‌دەکەوێ راستی‌یەکەیان پێ بڵێ. جا ئەو کاتەیە کە زۆر گیرو و گرفت و نارەحەتیی دەروونی پێک دێن.

هەمیشە بە هێنانە گۆڕی حەقیقەتەکان لەگەڵ منداڵانتان‌دا ئامادەیی بەرەورروو بوونەوە لەگەڵ کەسانی ناجسن و زار شڕیان تێدا پێک بهێنن. دەبێ هەموو کاتێک لەگەڵ منداڵ رەپ و راست بن. ئەگەر بابێک بە هەر

هۆیەک ماوەیەک لە زینداندا ژیاوە، یان دایکێک پێشتر بە کارەکەری ماڵان بە رێ‌چووە، وا چاکە منداڵەکەیان ئەو حەقیقەتانە هەرچی زووتر لەوان ببیسێ نەک لە زاری کەسانی دیکە. دیارە زۆر جاری واش هەیە کە راستی گوتن کارێکی ئەوەندە هاسان نیە. بۆ وێنە کاتێک یەکێک لە چەند منداڵی دایکێک لە دایکی دەپرسێ کێیەمانت لە هەموان خۆشتر دەوێ؟ وەڵامی گشتی و زۆر جار ناراست ئەوەیە کە من هەمووتانم وەک یەک خۆش دەوێ. دیارە ئەگەر ئێوە یەکێکیانتان لەوی دیکە یان لەوانی دیکە خۆشتریش بوێ ناتوانن ئەو مەسەلەیە ئاشکرا بکەن. چونکە ئەم کارە زۆر جار شوێنەوارێکی دڵتەزێنی بۆ منداڵەکانی دیکەتان بە دواوە دەبێ. بەڵام ئەدی لە کاتی وادا چ وەڵامێک بدەینەوە باشە، راستی‌یەکەی ئەوەیە بۆ خۆشم نازانم.

هیوادارم لە ئاکامی پەروەردە کردنی منداڵان لە موحیتێکی ئازاد و بێ‌ترس‌دا، نەسلێکی ئەوتۆ پێ بگا کە پێویستی‌یەکی بە درۆ کردن نەبێ. چونکە ئەگەر ترس نەبێ، پێویستیی درۆ کردنیش نامێنێ.

## بەرپرسایەتی

لە نێو زۆر لە بنەماڵەکاندا «منایەتی» (Ego) و شەخسییەتی منداڵ دەکەوێتە بەر دەستدرێژی. چونکە دایک و بابەکان بە چاوی ساوایەک هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکەن. ئەوان وا بیر دەکەنەوە کە منداڵەکانیان قەت گەورە نابن و هەر بە ساوایی دەمێننەوە. زۆر لە کچانی چاردەساڵە لەبەر ئەوەی کە دایک و بابەکانیان لێیان دڵنیا نین، لە ماڵێدا ئەو حەقەیان نیە ئوجاقی گاز داگیرسێنن. دایک و بابەکان بە مەبەستی خۆش‌خزمەتی، زۆر لەو بەرپرسایەتی‌یانەی دەکەونە سەرشانی منداڵان، بۆخۆیان ئەنجام دەدەن. ئەوان پەیتا پەیتا دەستوور بە منداڵی خۆیان دەدەن و پێیان دەڵێن:

«بەرخم بلووزەکەت بکە بەرت، ڕەنگە هەواکە ساردی کا»
«تخوون ڕنگای شەمەندەفەر نەکەوی»
«ئەم بەیانی‌یە جوانت خۆ شوشت؟»

جارێک ژنێک کە کچەکەی بۆ ناونووس کردن هێنابووە قوتابخانەکەمان، دەی‌گوت: کچەکەی بایەخێکی ئەوتۆ بۆ پاک و خاوێنی دانانێ و دەبێ ڕۆژێ دەجار وەبیری بێنمەوە جا دەست و چاوی دەشوا. بەڵام هەر لە ڕۆژی هەوەڵی وەرگیران لە قوتابخانەکەمان، ئەو کچە بێ ئەوەی کەس پێی بڵێ، بە پاک و خاوێنیی خۆی ڕادەگەیشت. دەست و دەم و چاوی هەمیشە جوان و خاوێن بوون. وەک دایکی دەی‌گوت لە ماڵێ پاک و خاوێن نەبووە . ڕەنگە هەر دایکی پێی وا بووبێ پاک و خاوێن نیە . بەو هۆیە بووە کە دایک وەک ساوایەک ڕەفتاری لەگەڵ کردوە و ئامادە نەبووە زۆر لە ئەرک و بەرپرسایەتی‌یەکانی خۆی بە خۆی بسپێرێ.

واباشە هەر منداڵەی بە پێی توانای خۆی بەرپرسایەتیی جۆربەجۆری بخەینە سەر شان. لە قوتابخانە، ئێمە ئەو مەیدانەمان داوە بە منداڵە چکۆڵەکان کە بۆخۆیان قاپی سووپە گەرمەکەیان هەڵگرن و بیبەنە ساڵۆنی نان خواردن. قوتابی‌یەکی ٧ ساڵە ئەو ئیجازەیەی هەیە لە هەموو ئەو ئامرازانە کە ئەمن بۆ کارکردن بە کاریان دێنم وەک مقەست و چەقۆ و بیور و مشار، کەڵک وەربگرێ. لەکاتی کار کردن بەو جۆرە ئامرازانە ئەمن پتر دەست و پەلی خۆم بریندار دەکەم تا ئەو قوتابی‌یە!

لێرەدا پێویستە وەبیر بێنمەوە کە نابێ بەرپرسایەتی و ئەرک ناسی (احساس وظیفه)تان لی تێک بچێ. ئەرک ناسی شتێکە کە منداڵ دوایە کە گەورەتر بوو، فێری دەبێ. ئەو قوتابی‌یانەی لە پانسیۆن دەژین، یان ئەوانەی لە دایک و بابیان دوورن بێ ئەوەی بۆخۆیان بیانەوێ، ناچارن نامە بۆ دایک و بابیان بنووسن. زۆرجار دیومە ئەوان لە دەست نووسینی

ئەو جۆرە نامانە پڕتە و بۆڵەیان هاتوە. ئەوان پێیان وایە کە نامە نووسین بۆ دایک و باب دەبێتە هۆی داهێزرانیان، بەتایبەتی ئەگەر ئەو کارەیان بەسەر داسەپابێ و ئێمە لەسەرمان کردبێ بە ئەرک و لەو بارەیەوە ئامۆژگاریمان کردبێ و ڕێ و شوێنمان بۆ دانابێ.

ئەو دایک و بابانەی وابیر دەکەنەوە کە دەبێ بەرپرسایەتیی منداڵانی چووکە بە منداڵانی گەورەتر بسپێرن، بەتەواوی لە هەڵەدان. زۆر لە دایک و بابەکان ئەو حەقیقەتە تێ ناگەن کە نابێ بە منداڵە سێ ساڵەکەیان بڵێن: تۆ چونکە لە براسێ ساڵەکەت گەورەتری کەوابوو دەبێ ئاگات لێی بێ تا کاری پڕ مەترسی ئەنجام نەدا.

نابێ بەرپرسایەتی‌یەکمان لە منداڵ بوێ کە ئامادەیی بەرێوەبردنی نیە. یان لێمان بوێ بریاری ئەوتۆ بدا کە جارێ هێشتا بۆ وی زووە. لە پانسیون ئێمە هەرگیز پرس بە منداڵێکی ٥ ساڵە کە نەخۆشە و لەرز و تا دای‌گرتوە ناکەین کە پێی خۆشە بچێ یاری بکا یان نا؟ ئێمە هەر کارێکی سەبارەت بەو پێویست بێ ئەنجامی دەدەین. کەوابوو هەر دایک و باوکێک دەبێ بە گوێرەی ئەو ئاسیاوی‌یەی لەسەر منداڵی خۆیان هەیانە بریار بدەن کە تا کوێ بەرپرسایەتی بە منداڵەکانیان بسپێرن و چ کاتێکیش بەرپرسایەتیی ئەوان بگرنە ئەستۆی خۆیان. بۆ وێنە لە بارەی هەڵبژاردنی جل و بەرگەوە دەکرێ بریار بە منداڵەکە بێ. ئەو دایک و بابانەی ئازادیی هەڵبژاردنی لیباس لە منداڵانیان دەستێننەوە ترسی ئەوەیان هەیە کە منداڵەکەیان بە هەڵبژاردنی جل و بەرگی نالەبار پلە و پایەی کۆمەڵایەتیی ئەوان تووشی مەترسی بکا.

باشترین رێگا ئەوەیە بە پێی توانا بەرپرسایەتی بخەینە سەرشانی منداڵان و هەر لەو کاتەش‌دا بەتەواوی وشیاری ئەمنییەت و سلامەتی‌یان بین. ئەوەتەنیا رێگایەکە کە بروا بەخۆبوون لە منداڵ‌دا بەهێز دەکا و ئامادەیی پێویستی بۆوەرگرتنی بەرپرسایەتی لەداهاتوودا تێدا

پێـک دێنێ.

## گوێ ڕایەڵی و نەزم پاراستن

یەکەم پرسیار کە لەو پێوەندی‌یەدا دەتوانین بی‌هێنینە گۆڕێ ئەوەیە کـە منداڵ بۆچی دەبێ گـوێ ڕایەڵ بێ و دەسـتـوور بەرێوە بەرێ؟ لە ڕوانگەی منەوە وەڵامەکەی ئەوەیە کـە گەورەساڵان تینووی دەسەلات و فەرمان دانن و ئەوە منداڵانن کە دەبێ ئەو تینوێتی‌یەیان بشکێنن. ئەگینا چ هۆیەکی دیکەی هەیە؟

مسۆگەر، ئێوە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێن: ئەگەر منداڵ گوێ ڕایەڵ نەبێ، لەوانەیە بە پێخـواسی لە مـاڵێ بچـێتـە دەر و بەری پێی بریندار بێ، یان لە بەرزایی‌یەک را هەڵدێرێ و هەزاران ئەگـەری دیکە. قسەی تێدانیە کە هەرکات مەترسیی گیانی بۆ منداڵ لە گۆڕێ دایە، ئەو دەبێ فەرمانبەر و گوێ ڕایەڵی قسەی گەورەکانی بێ. بەلاّم بەڕاستی داخوا منداڵ لەسەر دەرباز بوون لە خەتەر سەرکۆنە و تەمبێ دەکرێ؟ ڕەنگە بکرێ بڵێین هەرگیز! چونکە لەو جۆرە کاتانەدا باوەشی پێ دادەکەین و دەڵێین: «شوکر بۆ خوا کە بە ساغی دەرچووی» . بە پێچەوانە زۆرتر لەسەر کردەوە چووکەکانە کە منداڵ سەرکۆنە و تەمبێ دەکەین.

لەوانەیە ئەندامـانی بنەمـاڵەیەک بێ‌ئەوەی منداڵەکانیـان بە چاو و گوێ بەستراوی گوێ ڕایەڵ بن و لە دایک و بابیان بترسێن، ژیانێکی بێ گیروگرفت و دەردی‌سەر تێپەر بکەن. لەم جۆرە بنەماڵانەدا فەرمانبەری و گوێ‌ڕایەڵی بۆ گەورە و چووکە وەک یەکە و لە خزمەت خێر و خۆشیی هەموو ئەندامانی بنەماڵە دایە. بە وتەیەکی دیکە نەزم و گوێ ڕایەڵی لە نێوان دایک و باب و منداڵاندا دوو لایەنەیە. بۆ وێنە کـاتێک من بە قوتابی‌یەک دەڵێم بچوو دەست دە کتێبی فیزیک و دەرسەکانت دەور

کەوە، ئەگەر بە گوێی نەکردم مانای ئەوەیە کە دەرسی فیزیکی بە دڵ نیە و چێژی لێ وەرناگرێ. خۆ بواردنی ئەو، نیشاندەری داخوازە دەروونی‌یەکانیەتی و زیانی کەسی دیکەی تێدا بەستە نیە. هەربۆیە منیش ئەو کارەی بە زۆری پێ ناکەم. بەڵام ئەگەر بە منداڵەکان بڵێم لەبەر ئەوەی باخچەکەم داچاندوە کەس حەقی نیە وەنێوی کەوێ و شیناوەردەکەم پێخوست بکا. ئەگەر نەشیانْ هەوێ بەقسەم بکەن، ناچاریان دەکەم. کەچی لەو جۆرە کاتانەدا عادەتەن بە قسەم دەکەن. هەروەک ئەگەر دۆستێکیان داوایان لێ بکا بێ ئیجازەی خۆی دەست لە تۆپەکەی نەدەن، بە قسەی دەکەن. چونکە ئەم جۆرە فەرمانبەری و گوێ‌رایەڵی‌یانە دوو لایەنەن. دیارە بە کردەوە، دایک و بابەکان یان گەورەکان لە پێوەندی لەگەڵ پارێزگاریی منداڵاندا، بەرپرسیارن. بەڵام ئەگەر بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەو بەرپرسایەتی‌یە، گەورەکان پێویستی‌یان بە گوێ رایەڵیی منداڵان هەیە، لە بەرامبەردا بۆخۆشیان دەبێ گوێ‌رایەڵ بن. بۆ وێنە کاتێک من بە کچەکەم دەڵێم حەقت نیە بۆ یاری کردن خاک و خۆڵ بێنیە نێوماڵێ و ئەو کارەم لێ منع کردوە، کاتێکیش دەچمە ژوورەکەی وی و حەز دەکا بە تەنیا بێ و پێم دەڵێ: «لەم وەختەدا پێم خۆش نیە لە لای من بی، بڕۆ دەرێ» ئەمنیش لە قسەی دەرناچم و وەدەر دەکەوم. کەوابوو ئەگەر قەراربێ فەرمانبەری و گوێ رایەڵی بەرقەرار بێ، دەبێ بۆ گەورە و چووکە وەک یەک بێ.

لە قوتابخانەی ئێمە، منداڵان بۆخۆیان یاسا و ڕێ و شوێنەکان دیاری دەکەن و بەرێوەیان دەبەن. ئەگەر یەکێک لەوان سەرپێچیی قانوون بکا، منداڵانی دیکە رەخنەی لێ دەگرن. ئەو کارە بێ‌ئەوەی بەکارهێنانی توند و تیژیی لەگەڵ دابێ زۆر بەباشی بەرێوە دەچێ. هەرکەس ئازادە چی پێ خۆشە ئەنجامی بدا، بەو مەرجەی ئازادیی ئەوانی دیکە پێشێل نەکا. بە بڕوای من ئەو کارە دەکرێ لە نێو هەر تاقمێکی چووک و گەورە،

وەک بنەماڵە و کۆمەڵیش‌دا بەرێوە بچێ.

لە هیچ کام لەو بنەماڵانەدا کە ئازادی هەیە، نیازێک بە بەکار هێنانی زۆر و توندوتیژی نیە. لەم جۆرە بنەماڵانەدا لە کەس نابیسرێ بڵێ: «دەبێ لە قسەم دەرنەچی» یان «ئەوکارە دەبێ بکرێ چونکە ئەمن دەستوورم داوە». دایک و بابەکان چاوەڕوانی‌یان لە منداڵانیان ئەوەیە: ئاکار و هەڵس و کەوتی ژیرانەیان هەبێ. ئەگەر منداڵان لەکاتی نان خواردن‌دا، چێشتی زیاتر بکەنە نێو قاپەکانیان و نەتوانن هەمووی بخۆن، نابێ زۆری‌یان لێ بکەین. چونکە منداڵان نازانن چەندەیان بۆ دەخورێ تا بەو رادەیە چێشت بۆ خۆیان تێ بکەن. دایک و بابی باش ئەو دایک و بابانەن کە خۆیان لە جێی منداڵانیان دادەنێن و لەوان تێ دەگەن. منداڵ دەبێ بۆخۆی گوێ‌ڕایەڵ و نەزم پارێزی رەچاو بکا نەک ئێمە بەسەری‌دا بسەپێنین.

«انضباط» ئامانجێک نیە کە رەوا بێ هەر ئامرازێک بۆ سەپاندنی بە کار بێنی. لە نێو هێزە نیزامی‌یەکان‌دا «انضباط» یەکێک لە پێویستی‌یەکانی شەڕ کردنە و سەرباز دەزانێ ئەگەر گوێ ڕایەڵ نەبێ ونەزم بشێوێنێ، تەمبێ دەکرێ. جۆرێکی دیکە لە «انضباط» هەیە کە لە نێو تاقمی ئورکێستری موسیقادا رەچاو دەکرێ و ئەندامانی تاقمەکە دەبێ بەرەچاو کردنی نەزم، ئەمری ڕێبەریی ئورکێستر بەجێ بگەیەنن. لە قوتابخانەش جۆرێک لە «انضباط» پێویستە، بەڵام ئەو چەشنە «انضباط»ە کە لە نێو هێزە نیزامی‌یەکان‌دا هەیە. لە ژیانی نێو بنەماڵەش‌دا پێویستیمان بەم جۆرە نەزمە هەیە. لە بنەماڵەیەکی تەواو (متعادل) دا، هەموو ئەندامانی بنەماڵە نەزم، بە مەبەستی هاوهەنگاویی نێوان خۆیان و هەرچی باشتر کەلک وەرگرتن لە ئیمکانات، بەکار دێنن.

ئەگەر رۆژێک یەکێک لە ئەستێرەیەکی دیکەوە بێتە سەر زەوی و ببینێ کە هێشتا دایک و باب و ماموستای ئەوتۆ هەن کە منداڵان لەسەر هەڵە

نووسینی ڕێنووس و حیسێب نەزانین، تەمبێ دەکەن، وابیر دەکەنەوە کە ئێمە ئینسانەکان لە باری عەقل و مێشکەوە دواکەوتووین. دایک و بابەکان دەبێ داوا بکەن سیستەمی پەروەردە و فێرکردن لە تەمبێی جیسمی پاک بکرێتەوە. ئەو مامۆستا و فێرکارانەی تا ئێستاش لەم جۆرە تەمبێ کردنە کەڵک وەردەگرن دەبێ بزانن تەنیا ڕق و بێزاریی لە دژی خۆیان لە منداڵاندا پێک دێنن. بەداخەوە ئەو دایک و بابانەی بۆخۆیان بە منداڵی لە ئازادی بێبەش بوون و لەسەر هەر کارێکی بچکۆلە تەمبێ کراون، لایەنگری تەمبێ کردن و سزادانی منداڵانن.

لێرەدا پێویستە وەبیر بێنمەوە کە مەبەستی من لاچوونی بێئەم لاوئەو لای نەزم و گوێ ڕایەڵی لە ماڵێدا نیە. من لایەنگری ئەوەم کە «انضباط» پارێزەری مافی هەموو ئەندامانی بنەماڵە بێ. بۆ وێنە ئەگەر من ڕێگا بە کچەکەم نادەم یاریی بە تایپەکەم بکا، ئەویش ئەو مافەی هەیە لە کاتی دەور کردنەوەدا لەمنی بوێ بێدەنگی بپارێزم و خوێندنەوەی لێ تێک نەدەم. لە بنەماڵەیەکی تەواو (متعادل)دا نەزمێکی لەو چەشنە، زۆر سروشتی دێتە بەرچاو و بە باشی بەرێوە دەچێ. ژیان بریتییە لە پێوەندی و تێکەڵاوییەکی دڵگر. دایک و باب و منداڵانیان دەبێ دۆست و هاوڕێی یەکتر بن و هەر مافێکی بۆ خۆیانیان دەوێ، بۆ ئەندامانی دیکەی بنەماڵەش بە ڕەوای بزانن.

لە بنەماڵەیەکی ناتەواو (نامتعادل)دا نەزم وەک چەکێک کەڵکی لێ وەردەگیرێ و فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵیی کوێرانە وەک تایبەتمەندییەکی بەرزی ئەخلاقی دەناسێندرێ. لەم جۆرە بنەماڵانەدا منداڵان لەگەڵ مێز و کورسی و بەخچاڵ و تەلەویزیون و کەل و پەلی دیکەی نێو ماڵێ، نرخ و بایەخێکی وەک یەکیان هەیە. ئەو دایک و بابانەی بۆ خۆیان ڕێز بۆ یەکتر دانانێن، زیاتر لە کەسانی دیکە فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵییان لە منداڵانیان دەوێ. چەند ڕۆژ لەمەوبەر

ئاگام لێ بوو بابێک کە بۆ خۆی سیغاری بەدەمەوە بوو، منداڵەکەی لەسەر سیغار کێشان تەمبێ دەکرد. جارێکی دی بابێکم دیت قسەی سووکی بە منداڵەکەی دەگوت چونکە جنێو و قسەی ناشیرینی بەزاری داهاتبوو. کاتێک من بە گژی داهاتمەوە و پێم گوت ئەگەر جنێوت پێ شتێکی خراپە ئەدی بۆچی بۆخۆت جنێوان بە منداڵەکەت دەدەی؟ لە وەڵامدا گوتی : من و ئەو فەرقمان هەیە، ئەو منداڵە و من گەورەم!

چاوەڕوانیی فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵیی کوێرانە هەمیشە ڕەنگدانەوەی ڕق و بێزاریی دایک و بابەکان لە ژیانە و نیشان دەدا کە ئەوان توانای ئەوەیان نیە تام و چێژ لە ژیان وەرگرن. ئەوان لە چێژ وەرگرتن و خۆشویستنی ژیان دەترسێن. دایک و بابە سەرکوتکراوەکان هەوڵ دەدەن بە ئاکار و کردەوەکانیان نەهێڵن منداڵەکانیشیان تام و چێژ لە ژیان ببینن. ئەوان لەسەر چووکترین کردەوەکان منداڵانیان سزا دەدەن و وابیر دەکەنەوە کە تەمبێ کردن و گوێ ڕایەڵی تاقەڕێگای سەرکەوتنی بێ ئەم لاو ئەولای منداڵەکانیانە.

جیاوازیی قوتابخانەی ئێمە لەگەڵ قوتابخانە کۆنەکان لەوە دایە کە ئێمە بڕوامان بە شەخسییەتی منداڵ هەیە بەڵام لە قوتابخانە کۆنەکاندا ئەو بڕوایە نیە. ئێمە دەزانین ئەگەر قوتابییەک بێ‌هەوێ ببێ بە دوکتور، سەرەنجام خۆ بە خوێندنەوە خەریک دەکا تا بتوانێ لە تاقیکردنەوە جۆراوجۆرەکاندا قبووڵ بێ. بەڵام لە قوتابخانە سوننەتییەکاندا وابیر دەکرێتەوە کە بۆ ئەوەی منداڵ سەرکەوێ دەبێ ناچار بکرێ دەرسەکانی فێر بێ. مەبەستی من ئەوەیە کە بڵێم لە بنەماڵەیەکدا کە منداڵ هەر لە ڕۆژی هەوەڵی ژیانیەوە سەربەست بووە فەرمانبەری و گوێ ڕایەڵیی پێویست نیە. منداڵان خۆشەویستی و دۆستایەتی بە خۆشەویستی و دۆستایەتی و ڕق و بێزاری بە ڕق و بێزاری وەڵام دەدەنەوە. نزیکەی چل ساڵە ڕاهێنەری منداڵانم و لەو ماوەیەدا لە هیچ منداڵێکم نەداوە. بەڵام

ئەو کاتەی مامۆستایەکی لاو بووم قوتابی‌یەکانم بە قایش پشتێنەکەم تەمبێ دەکرد و هیچ بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ئەو کارەم لەوانەیە منداڵان لەگەڵ زۆر مەترسی بەرەو روو بکا. ئێستا کە لە مەترسی‌یەکانی ئەو چەشنە توند و تیژی‌یە تێ‌گەیشتووم هەرگیز پەنای بۆ نابەم. ئێمە هەروا کە رێز لە شەخسییەتی گەوران دەنێین بە چاوی رێزیشەوە دەروانینە شەخسییەتی منداڵان و هەر بەو جۆرە کە گەورەیەک بۆ خواردنی سووپی گێزەر دەفشار نانێین، زۆری لە منداڵێکیش ناکەین بیخوا.

داهاتووی مرۆڤایەتی لە دەست دایک و بابەکان دایە. ئەگەر ئەوان زیندوویی و ژیانی رووحیی منداڵانیان، بە هۆی دەسەڵاتی ملهوڕانەی خۆیانەوە بڕێنن، شەڕو جینایەتیش لە جیهاندا هەروا درێژەی دەبێ. ئەگەر ئەوان لەسەر نەزم و رێ و شوێنی زۆردارانەی دایک و بابی خۆیان برۆن ، خۆشەویستیی منداڵانیان لە دەست دەدەن. چونکە هیچ کەسێک ناتوانێ ئەو کەسەی خۆش بوێ کە لێی دەترسێ. ئاڵۆزی و نەخۆشی‌یە رووحی‌یەکان لە ئاکامی ئەو نەزم و رێ و شوێنە نامەنتیقی و زۆردارانەیەدا کە لە نێو بنەماڵەکاندا هەیە و لەگەڵ ئەوین و خۆشەویستی ناتەبایە، سەر هەڵ دەدەن. نارەحەتی و ئاڵۆزی‌یەکانی منداڵ دەبێ بە پەرە پێدانی ئەوین و خۆشەویستی و گەرم و گوڕی لەنێو بنەماڵەدا بنەبڕ بکرێن. ئەگەر منداڵان لە ماڵێدا لە نێو ئەوین و خۆشەویستی و تەبایی و پشتگیریی دایک و بابەکانیاندا بژین، رق و بێزاری و هەستی حەز کردن لە تێکدەری و گیرە شێوێنی‌یان تێدا پێک نایە و لەوەش گرنگتر تووشی گیروگرفتە عاتیفی و دەروونی‌یەکان نابن.

## سزا و پاداشت

رەنگە نەکرێ شوێنەوارە مەنفی‌یەکانی خەڵات کردن و دەسخۆشانە پێدان لەگەڵ ئاکامە خراپەکانی تەمبێ کردن و سزادانی منداڵ لە ریزی

یەک دابنێین. بەڵام ئەویش بەرە بەرە و بە شێوەیەکی نەرم و لەسەرەخۆ ئاکار و ئەخلاقی منداڵ خەراپ دەکا. خەڵات کردن و دەسخۆشانەدان کارێکی بێ خێرە و لە درێژخایەندا شوێنەوارێکی خراپ دادەنێتە سەر منداڵ. ئەگەر بۆ هەر کارێک دەسخۆشانە بدەینە منداڵ بەو مانایەیە کە کارەکە لە خۆیدا هیچ بایەخێکی نیە. بۆیە منداڵ وا رادێ کە هەموو کارێک بۆ ئەوە بکا کە خەڵات و پاداشی لەسەر وەرگرێ.نەک بۆ ئەوە کە چێژی لێ وەرگرێ.

هونەرمەندێک قەت تەنیا بە مەبەستی وەدەست هێنانی قازانجی ماددی بە لای داهێنانی هونەریدا ناچێ. دەسخۆشانەی راستەقینە ئەو خۆشی‌یەیە کە لە داهێناندا هەیە. لە کۆمەڵەکانی ئەمڕۆدا رقەبەری و خەڵات کردن لە تایبەتمەندی‌یە ئەسلی‌یەکانی نیزامە سیاسی و ئابووری‌یەکانن. لەو کۆمەڵانەدا مەبەستەکە هەمیشە ئەوەیە کە کارەکان دەبێ لەوانی دیکە باشتر جێبەجێ بکەین و وەک دەڵێن پێشیان بکەوینەوە تا سەرکەوین.

خەڵات و دەسخۆشانە شوێنێکی خراپی رەوانی لەسەر منداڵان دادەنێن چونکە هەستی ئیرەیی (حسادت) لەواندا دەهاروژێنن. ئیرەیی بردلی برایەک بە برا چکۆلەکەی زۆرجاران لەوەرا دێ کە بۆ وێنە پێی دەگوترێ: «برا چووکەکەت ئەو کارە لەتۆ باشتر بەرێوە دەبا». لە روانگەی منداڵی گەورەترەوە، بەراورد کردنی وی لەگەڵ برای لە خۆی چووکتر و راگەیشتنی زیاتری دایک بە برا چووکە، وەک ئەوەیە برا چووکە لە لایەن دایک یان بابەوە خەڵات کرابێ.

ئەگەر لە ئۆگری و سەرنج دانی منداڵ بە کەل و پەل و مەسەلەکانی دەور و بەری ورد بینەوە، ئەو مەترسی‌یانەمان بۆ روون دەبنەوە کە سزایان خەڵات لەگەڵ خۆیانی دێنن. هەردووی ئەم کردەوانە بریتین لە هەوڵێک کە گەورەکان لە رێگای فشارەوە بۆ راکێشانی سەرنجی منداڵان بەکاری

دێنن. بەڵام دیارە سەرنج ڕاکێشانی ڕاستەقینە ئەو کاتە دێتە دی کە توانای حەیاتیی شەخسییەتی منداڵ بە تەواوی دەکار بکرێ و ئەوەش شتێکە کە بۆخۆی دەبێ وەدی بێ. ڕەنگە بتوانین کەسێک ناچار بە وردبوونەوە لە بابەتێک بکەین. چونکە سەرنجدان و وردبوونەوە لە زاتی مرۆڤدا هەیە. بەڵام ئەوە کە داخوا ئەم سەرنجدان و ورد بوونەوەیە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ و دەکرێ ئۆگری بابەتێک بێن کە پێمان پێشنیارکراوە یان نا؟ شتێکی دیکەیە. لە قوتابخانە دەکرێ قوتابی‌یەک هەم چاوی بڕبپێتە تەختەرەشە و هەم نوقمی خەیاڵاتی خۆی بێ. بۆ وێنە هیچ کەس ناتوانێ من ناچار بکا بکەومە کۆ کردنەوەی تەمر، یان ئەو کارەم وەک شتێکی خۆش و دڵگر بخاتە بەرچاو. چونکە من هەر لە بنەڕەتەوە قەت کەیفم بە پێک هێنانی کلۆکسیۆنی تەمر نەهاتوە و ئەگەر بە هۆی خەڵات و دەسخۆشانەش یان لە ڕێگای فشارەوە ئەو کارەم بەسەر دابسەپێنن، هەر لەگەڵ نەمانی شوێنەوارەکانی خەڵات، یان ترس لە سزادان، وازی لێ دێنم. هەر لە جێدا خەڵات و دەسخۆشانەش هەروەک سزادان، بریتی‌یە لە سەرنج ڕاکێشان بە یارمەتیی فشار. بەو هۆیەوەش کە ئۆگری و سەرنج دانی دڵخوازانە و ئاگایانەی لەگەڵ دانیە لە درێژ خایەندا ئاکامێکی لەباری نابێ.

قوتابخانەکەمان باخێکی گەورەی هەیە کە من نۆک و لوبیا و توورم لێ کردوە. ئەمن دەتوانم لە قوتابی‌یەکان داوا بکەم لە بژاری باخەکەدا یارمەتیم بدەن. بەڵام تا ئێستا نەمدیوە ئەو منداڵە هەشت نۆ دەساڵ تەمەنانە بە دڵخوازی خۆیان هاوکاریم بکەن، چونکە هەڵکێشانی بژار بۆ ئەوان هیچ خۆشی‌یەکی نیە. هێندێک جار لێیان دەپرسم: کێهەتان ئامادەن لە بژارهەڵکێشاندا یارمەتیم بدەن؟ هیچیان بە هانامەوە نایەن. کاتێک هۆیەکەیان لێ دەپرسم، هەریەکەی بە جۆرێک وەڵام دەداتەوە: بەو کارە دادەهێزێین، یان بۆچی دەتەوێ هەڵیان کێشی لێیان گەڕێ با شین

بن و هەروەها دەڵێن: جارێ ئەوە خەریکی پڕ کردنەوەی چوارقوژبنم و ماوەم نیە، یان کەیفم بە باخەوانی نایە و ...

من بۆخۆشم ئەو کارەم زۆر پێخۆش نیە و حەز دەکەم لە جیاتی ئەو کارە چوار قوژبن پڕ کەمەوە. ئەگەر بەوێ بەسەداقەتەوە بۆ مەسەلەکە بچم دەبێ بڵێم ئاخر بەراستی بژار کردن دەتوانێ چ خۆشی‌یەکی بۆ منداڵ هەبێ؟ جگە لەمانەش باخەکە هی منە و کاتێک دەبینم ئەو نۆکەی چاندوومە شین بووە، هەست بە خۆشی و شادی دەکەم. منم کە لەو ڕێگایەوە پووڵێکم بۆ دەگەڕێتەوە و ناچار نابم نۆک و لوبیا بکڕم. بە وتەیەکی دیکە ئەو کارە قازانجی شەخسیی منی تێدایە و ئەو هەقەم نیە لەو پێوەندی‌یەدا داوای هاوکاری لە قوتابی‌یەک بکەم کە هیچ کەیفی بە بژار کردن نایە. تاقە ڕێگایەک بۆ وەدەست هێنانی هاوکاریی ئەوان ئەوەیە کە هەقدەستیان بدەمێ. لە حاڵەتێکی ئاوادا هەر دوو لامان دەبینە خاوەن قازانج. من بیر لە باخ و بەرو بووەکەی دەکەمەوە و ئەوانیش بیر لە گیرفان پووڵیی زیاتر.

سەرنج و ئۆگری هەر لە جێدا بارێکی خۆ ویستانەی هەیە. کاتێک قوتابی‌یەکی چاردە ساڵەی قوتابخانەکەمان دێتە لام و سەرەرای ئەوەی لە باخەوانی بێزارە، حازر دەبێ هاوکاریم بکا لەبەر ئەوەیە کە پێی خۆشە ڕووبەروو بێن و بتوانێ بە دڵی خۆی قسەم لەگەڵ بکا. کەوابوو هاوکاری کردنی وی لەگەڵ من لە کاری بژار دا، وەڵامدەری تاسە و مەیلی خۆی بۆ دواندن و مانەوە لەگەڵ منە. یان کاتێک یەکێکی دیکە لە قوتابیان سەرەرای جارز بوون لە باخەوانی ئامادەیی خۆی بۆ بژار دەربڕێ دەزانم مەبەستەکەی ئەوەیە لە پەنا ئەو کارەدا قەڵەمبڕەکەم لێ وەربگرێ و کایەی پێ بکا. کەوابوو ئەوە قەڵەمبڕەکەی منە ئەوی بۆ هاوکاری ڕاکێشاوە نەک بژار کردن.

خەڵات و دەسخۆشانە دەبێ بەرلە هەر شتێک ببنە هۆی دابین بوونی

ڕەزامەندیی دەروونی واتە ڕەزامەندی و خۆشحاڵی لە تەواو کردنی کارەکە. لە دنیای ئەمڕۆدا زۆر کار هەن کە مرۆڤ دادەهێنێن و ڕەزامەندی و خۆشیی شەخسی‌یان بەدواوە نیە. وا دیارە ئێمە دەمانەوێ قوتابخانەکانیش بۆ پێ ئەسپاردن و جێبەجێ کردنی ئەم کارە داهێنەرانە ئامادە بکەین. کاتێک ئێمە قوتابیان و خوێندکاران ناچار دەکەین فێری شتی‌وا نەبن کە عەلاقەیان پێی نیە، لەم ڕێگایەوە دەیان خەینە نێو هەل و مەرجێک کە لە داهاتوودا کارو ئەرکی نابەدڵیش کە بۆ ئەوان هیچ چەشنە تام و چێژ و داهێنانێکی تێدا نیە، قبووڵ بکەن.

منداڵ دەبێ لەبەر ئۆگری و پێخۆش بوونی خۆی فێری خوێندنەوە و نووسین و حیسێب بێ نەک لەبەر ڕەزامەندیی دایک و باب، یان وەدەست هێنانی ئەم یان ئەو ئامرازی کایە کردن کە دایک و باب بەڵێنیان داوە بۆی بکڕن. دایکێک دەناسم کە بەڵێنی دابوو بە کوڕەکەی ئەگەر واز لە مژینی قامکی دەستی بێنێ، رادیۆیەکی بۆ بکڕێ. ئەو پێشنیارە ئاڵۆزی و کێشەیەکی ناعادیلانە تووشی مێشکی منداڵ دەکا. چونکە قامک مژتن کردەوەیەکی دوور لە ئیرادەیە و بە ئیرادە کردن چارەسەر ناکرێ.

دایک و بابەکان لەبەر نیگەرانیی لە داهاتووی منداڵەکانیانە کە ئەوان بۆ خوێندنی دەرسەکانیان دەخەنە ژێر فشار یان بە دانی خەڵات و دەسخۆشانە ڕێزیان لێ دەنێن. ئەوان بە قسەی لەم چەشنە: «ئەگەر لە تاقیکاری‌یەکان‌دا نومرەی باش نەهێنیەوە دووچەرخەت بۆ ناکرم» عەلاقە بە فێر بوون و چێژ وەرگرتن لە فێر بوون لە منداڵانیان‌دا دەمرێنن. چونکە منداڵ وا دەزانێ کە لە بەر تەمبێ نەکران و یان وەدەست هێنانی دووچەرخەیە کە دەبێ دەرسەکانی بە باشی بخوێنێ.

کایە کردن بە هەستی منداڵان، جۆرێکی دیکەی شوێن دانان لەسەر ئەوانە. کاتێک بە منداڵێک دەڵێن: «ئەگەر دەرسەکانت بە باشی نەخوێنی، دایکت زۆرت لێ نارەحەت دەبێ». لەراستی‌دا دەمانەوێ گاڵتە

به هەستی عاتیفی ئەو بکەین کە دایکی لە رادە بەدەر خۆش دەوێ. ئەم جۆرە کارانە یانی لەبیر بردنەوەی ئۆگریی راستەقینەی منداڵ بە فێربوون.

• نابێ منداڵان بۆ ئەنجام دانی ئەو بەشە لە کارە گرانەکانی ماڵێ کە پێوەندیی راستەوخۆیان بە وانەوە نیە، بخەینە ژێر فشار. ئەگەر دەمانەوێ منداڵان ئەو بەشە لە کارەکانی ماڵی کە پێیان خۆش نین، ئەنجام بدەن دەبێ لە بەرامبەردا هەقدەستیان بدەینێ. ئەگەر من داوا لە منداڵان بکەم خشتەکانی ئەوسەری باخم بۆ بێننە پێشێ تا دیوارە رووخاوەکەی قوتابخانەی پێ دروست بکەمەوە بۆ ئەو کارە هەقدەستیان دەدەمێ. چونکە لەوانەیە لەو رێگایەوە بتوانم سەرنجیان بۆ لای ئەو قازانجە رابکێشم کە لەو کارە دەستیان دەکەوێ. دیارە ئەم جۆرە کارانە بڕگەیی (مقطعی)ن و لەگەڵ ئەو کارانە کە بۆ دڵگەرم کردنی منداڵان بە فێربوون کەڵکیان لێ وەردەگیرێ جیاوازییان هەیە. لەسەریەک من لەگەڵ ئەو روانگەیەدانیم کە پێی وایە کیرفان پوولیی منداڵان دەبێ سەبارەت بەو کارانە بێ کە لە ماڵێدا ئەنجامیان دەدەن. دایک و بابەکان دەبێ هەوڵ بدەن ئەوەندەی بۆیان دەکرێ لە بەرامبەر ئەو کارانەدا کە بۆ منداڵانیانی دەکەن هیچیان لێ نەوێن.

سزادانی منداڵان قەت ناتوانێ کردەوەیەکی دادپەروەرانە بێ، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بەراستی و بە تەواو مانا دادپەروەر و خاوەن ئینساف بێ. بۆ بەرێوەچوونی عەدالەت تێگەیشتنی تەواو لە مەسەلەکان پێویستە. ئێمە ناتوانین وا سووک و هاسان دادپەروەر و بە ئینساف بین. چونکە ئێمە خۆمان باش ناناسین و توانای ناسینی گرێمانە و ناکامییەکانی خۆمانیشمان نیە. ئێمە ئەو توانایەمان نیە دوور لە شوێنەوارەکانی گرێمانە و ناکامییەکانمان، منداڵانمان پەروەردە بکەین. تا ئێمە دیلی قەفەسی ترس و نیگەرانییەکانی خۆمان بین ناتوانین منداڵانمان لەژێر شوێنەوارەکانی ئەو ترس و گرێمانانە دەرباز بکەین و لە ئاکامدا ترس و

نیگەرانی‌یەکانی خۆمان تووشی وان دەکەین.

ئەگەر ئێمە هەوڵ بدەین زۆرتر لە رەفتاری خۆمان ورد بینەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە زیاتر ئەو کاتانە منداڵان تەمبێ دەکەین کە لە دەرەوەی ماڵێ تووشی گیروگرفت و کەند و کۆسپ هاتووین و قەڵسی و تووڕەیی خۆمان بەوان دەردەکەین. چەندین ساڵ لەوە پێش، رۆژێک قوتابی‌یەکانم تەمبێ کرد، چونکە قەرار بوو لەو رۆژەدا «بازپرس»ێک سەردانی قوتابخانەکەمان بکا. ئەمن بەو بۆنەیەوە نیگەران بووم و جگە لەوەش لەگەڵ یەکێک لە دۆستانم دەمەقاڵەم ببوو. کاتێک بە هەموو ماناوە هۆی ئەو تەمبێ کردنەم بۆ روون بۆوە بڕیارم دا کە هەرگیز هیچ منداڵێک تەمبێ نەکەم. لەم دوایی‌یانەدا یەکێک لەو قوتابی‌یانەی تازە هاتبووە قوتابخانەکەمان، ملی لە بەدفەری نابوو. بانگم کرد و پێم گوت: ئەگەر دەتەوێ بەم جۆرە کارانەت ناچارم بکەی لێت بدەم، لە خۆرایی سەری خۆت دێشێنی، لێرە لێدان نیە!» ئەو قوتابی‌یە وازی لە بەدفەری هێنا و ئیدی لەمەودوا پێویستیی نیشان دانی رق و بێزاریی لە خۆی دەرنەخست.

تەمبێ کردن هەمیشە بریتی‌یە لە دەربڕینی رق و تووڕەیی و منداڵ بە تەواوی هەست بەم مەسەلەیە دەکا. ئەو خۆشەویستی و پەژیوانی‌یە کە منداڵ دوای تەمبێ کران لە لای دایک و بابی دەری دەبڕێ، ئەوین و خۆشەویستیی راستەقینە نیە. ئەو هەستە کە منداڵ بە دوای تەمبێ کران‌دا تێی‌دا پێک دێ، رق و بێزاری‌یە کە خۆی دەگۆڕێ و بە شێوەی لاواندنەوە و خۆشەویستی خۆی دەنوێنێ تا هەستی خۆ بە تاوانبار زانین داپۆشێ. تەمبێ کردن، منداڵ بەرەو جیهانی خەیاڵ و زیندەخەو پاڵ پێوە دەنێ و لەوێ دایە کە لە نێو چوونی ئەو کەسەی تەمبێی کردوە بە ئاوات دەخوازێ. لە نێوچوونی بابی دەبێتە خۆزگەی. بەڵام ئەو خۆزگەیەش لە نێو دنیای تاوان و خۆ بە تاوانبار زانین‌دا نوقمی دەکا. لای خۆی وا

بیردەکاتەوە کە چونکە مەرگ و نەمانی باوکی خۆی بەئاوات خواستوە، ئینسانێکی نارەسەن و تاوانبارە. ئەو پەشیمانی و هەست کردن بەو تاوانباری‌یە وای لێ دەکا وەک منداڵێکی ژیر و باش لە کۆشی باوکی‌دا دانیشێ. بەڵام راستی‌یەکەی ئەوەیە رق و بێزاری هێشتا بەری نەداوە و لای ئەو ماوەتەوە.

خراپتر لە هەمووی ئەوانە، تەمبێ دەبێتە جغزێک کە لێ دەرباز بوونی ناموومکینە. منداڵ هەرچەند جاری تەمبێ دەکرێ وا هەست دەکا کە لێی بێزارن بۆیە تەمبێی دەکەن و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوە کە رق و دوژمنایەتی لەو دا پەل و پۆ داکوتێ. کاتێک رق و نەفرەتەکەی زیاتر دەبێ، زۆرتر لە پێشوو پەنا دەباتە بەر ئینکەبەری و ئاکاری ناجسنانە. لە ئاکامدا دیسان تەمبێ دەکرێتەوە. ئەوەش بە رق داکەوتنی زیاتر و ئەنجامدانی ئاکاری دزێوتر و سەرەنجام سەرلەنوێ تەمبێ کرانەوەی بەدواوەیە و لە ئاکامدا دەبێتە منداڵێکی قین لە زگ و نالەبار و تەمبێ کردن هیچ شوێنێکی لەسەر دانانێ. بەڵام لەبەر ئەوەی پێویستیی بە لاواندنەوە و خۆش ویستن لە لایەن دایک و بابەوە هەیە، بۆ بزواندنی دژکردەوەی عاتیفیی ئەوان پەنا بۆ هەر کارێک دەبا. منداڵ ئەگەر هیچ نیشانەیەک لە خۆشەویستیی دایک و بابی بەدی نەکا، هەوڵ دەدا تەنانەت بە هۆی ئەنجام دانی کاری دزێویش بووە سەرنجی ئەوان بۆ لای خۆی راکێشێ. بەم جۆرە ئەو تەمبێ دەکرێ و دوایەش هەست بە پەشیمانی دەکا بەڵام بۆ رۆژی داهاتوو سەرلەنوێ کردەوەکەی دووپات دەکاتەوە. ئەو دایک و بابانەی لە ئاست منداڵانیان بێ تەفاوەتن لەگەڵ ئەم خول و سوورەی رق و کینەی خۆیان و منداڵانیان زیاتر ئاشنان. چونکە لە روانگەی منداڵەوە تەمبێ کران لە بێ تەفاوەتیی دایک و باب و بێبەشی لە رێز و خۆشەویستیی ئەوان باشترە.

ئەزموونی چەندین ساڵەم گەیاندوومیە ئەو ئاکامە کە منداڵانی ئازاد

و سەربەخۆ پێویستی‌یەکیان بە سزادان نیە و پێ ناگەنە نێو جەغزی ئەو رق و کینەیەوە. ئەم جۆرە منداڵانە لەبەر ئەوەی هەرگیز تەمبێ ناکرێن، درۆ کردن و شکاندنی کەل و پەل بە پێویست نازانن. کەس «ناجسن» و «نارەسەن» و قسەی ناشیرینی دیکەیان پێ ناڵێ و ئەوانیش بیری بەربەرەکانیی دایک و بابیان بە مێشک دانایە. رەنگە هێندێک جار سەربزێوی بکەن بەڵام ئەم حاڵەتەیان زۆر ناخایەنێ و لە دەمار (عصب)ەکانیان‌دا ئاڵۆزی پێک نایە.

بەڵام ئەو راستی‌یەش هەیە کە بە هاسانی ناتوانین روونی بکەینەوە کام کردەوە تەمبێ کردنە و کامیان نا. رۆژێک، کورێکی قوتابیی قوتابخانەکەمان یەکێک لە باشترین مشارەکانی بە ئەمانەت لێ وەرگرتم تا کاری پێ بکا. رۆژی دوایی دیتم مشارەکەم لە نێوەراستی حەساری‌دا لەبەر بارانە کەوتوە. هەر بۆیە پێم راگەیاند کە ئیدی تا هەم مشاری بە ئەمانەت وێ نادەم. ئەم کارە سزادان نەبوو. چونکە سزادان قەزاوەتی ئەخلاقیشی لەگەڵ دایە. منداڵ دەبێ فێر بێ کە نابێ ئەو ئامرازانەی لە خەڵکی دیکەی بەئەمانەت وەرگرتوون بشکێنێ و بێ‌شوێنیان بکا. ئیجازەدان بە منداڵ بۆ ئەوەی هەر کارێکی پێی خۆشە ـ ئەویش بە ئامراز و کەل و پەلی خەڵکی دیکە ـ ئەنجامی بدا، ئاکامێکی باشی نابێ. ئیجازەدانێکی ئەوتۆ منداڵ دەکا بە شتێکی بێ چاو و روو و نازنازی و منداڵێکی بێ‌چاوورووش نابێتە مرۆڤێکی بەکەلک.

ماوەیەک لەمەوبەر منداڵێکیان هێنایە قوتابخانەکەمان کە لە قوتابخانەکەی پێشووی بە هۆی توند و تیژی و ئاکار و کردەوەی مەترسیی خوڵقێن، ترس و وەحشەتی خستبووە نێو دڵی هەمووان و لەسەر ئەو مەسەلەیە لە قوتابخانە دەریان کردبوو. لە قوتابخانەی ئێمەش ئەو کردەوانەی دووپات کردەوە. من گەیشتمە ئەو ئاکامە کە دەیەوێ بەم کارانەی ئێمە تووڕە بکا و سەرنجمان بۆ لای خۆی رابکێشێ. رۆژێک لە

کاتی وەرزووروکەوتن لە سالۆنی کایە کردنی قوتابی‌یەکان‌دا، دیتم هەموو قوتابی‌یەکانێ لە قولینچکێکی ژوورەکەدا کوشم هەلاتوون و ئەو قوتابی‌یەش چەکوچێکی دەست داوەتێ، لای دەرگای لێ گرتوون و هەرەشە دەکا هەرکەس لیی نزیک بیتەوە، بەچەکوچ لەسەری دەدا.

من پێم گوت: «بەسە واز بینە ئەوەندەی بزانە من لێت ناترسێم».

چەکوچەکەی دانا، هەرای کردمێ و دەستی کرد بە شەق هاویشتن و گەزتنم. پێم گوت چ بکەی ئەوەت لەگەلْ دەکەمەوە. بەشەق لێم دەی بە شەق لێت دەدەمەوە. هەر ئەوەشم لەگەلْ کرد. زوو وازی لە دەست کردنەوە هێنا و لیی دا رۆیی.

بە بڕوای من ئەوەیان سزادان نەبوو. دەرسێکی پێویست بوو و دەبووْ فێربێ کە ناکرێ هەرکارێکی پێی خۆشە بیکا.

لە نێو زۆر بنەماڵەکان‌دا کاتێک منداڵ بێ گوێ‌یی و جوابە جەنگیی کرد، سزای دەدەن. لە قوتابخانەکانیش‌دا بێ گوێ‌یی و بێ قسەیی کردن وەک کردەوەیەکی پڕ مەترسی چاوی لێ دەکرێ. کاتێک ئەمنیش مامۆستایەکی لاو بووم بێ قسەیی کردنی قوتابیان زیاتر لە هەر کارێکی دیکە توورەی دەکردم. چونکە پێم وابوو منداڵان بەم کارەیان سووکایەتیم پێ دەکەن. من لە بەرامبەر قوتابیان دا خۆم وەک شتێکی زۆر گرنگ و بە دوور لە هەرکەم و کووری‌یەک دەهاتە بەرچاو. راست وەک ئەو بابانەی لە ماڵێ‌دا ملهورانە دەجوولێنەوە و پێ‌یان وایە ئەوەی کەم و کورتی و لاوازی بێ، لیی بە دوورن. بەر لە سزادانی منداڵان واباشترە لە خۆمان بپرسین داخوا بۆخۆمان هیچ هەڵە و لاوازی‌یەکمان نیە؟

لەم دوایی‌یانەدا رۆژنامەکان هەواڵی گیران و موحاکەمە کردنی دوو کوڕی تاوانباریان بلاو کردەوە. لێکۆلەرەوە (بازپرس) لەکاتی لێکۆلینەوەدا بەو دوو لاوەی گوتبوو: ئەگەر باوکتان بە منداڵی ئێوەی سزادابا، کارتان نەدەگەیشتە ئێرە. بەلام بە دوای قسەی شاهیدەکان‌دا

روون بۆوە کە ئەو دوو برایە بە منداڵی رۆژ نەبووە نەکەوتبنە بەر لێدانی بابیان.

پێم خۆشە ئەوجاریش دووپاتی کەمەوە کە سزادانی ئەوکاتە شوێنەوارێکی خراپ و نالەباری دەبێ کە قەزاوەتی ئەخلاقی و واتای چاکە و خراپەی لەگەڵ دابێ. ئەگەر لە کووچە و کۆڵانان، منداڵێک بەردێکم باوێتێ بۆ ئەوەی کڵاوەکەم بخاتە خوار، راست دەچم دەیگرم و گوێی با دەدەم. بە دڵنیاییەوە دەڵێم ئەو منداڵە دژکردەوەکەی من بە شێوەیەکی سروشتی قبووڵ دەکا. بەڵام ئەگەر پێی بڵێم دەچمە قوتابخانەکەتان و لای بەڕێوەبەری قوتابخانە شکایەتت لێ دەکەم با تەمبێت بکا، ئەو ترسەی لە ئاکامی ئەو جۆرە تەمبێکرانەدا تێیدا پێک دێ وەزەندی زۆری پێ دەگەیەنێ. چونکە ئەو کات سزادران لای ئەو مانای تێهەڵدران و فێر بوونی دەرسی ئەخلاق پەیدا دەکا و وابیر دەکاتەوە کە بەراستی جینایەتی ئەنجام داوە.

دەتوانن زۆر بە هاسانی ئەو دیمەنە بێننە بەرچاو کە ئەمن بە مەبەستی سکاڵا دەربڕین چوومە بۆ قوتابخانەی ئەو منداڵە. ئەمن لە حاڵێکدا کڵاوەکەم بە دەستەوەیە پێ دەنێمە نێو قوتابخانە. بەڕێوەبەر کە لە پشت مێزەکەی خۆی دانیشتوە بە سام و هەیبەتەوە لە منداڵەکە دەڕوانێ. منداڵەکەش لە ترسان سەری بەرداوەتەوە و چاوی دەهەردی بڕیوە. بەڵام ئەو کاتەی هەر لە کۆڵانێدا بەرەنگاری وی دەبمەوە. دژکردەوەکەم بەرامبەر و پڕ بە پێستی کارەکەیەتی. جگە لەوە، منداڵەکە ئەوەش فێر دەبێ کە ئەگەر لەکووچە و کۆڵانان کەسێک ئازار بدا، ئەو کەسەش دژکردەوەی گونجاوی پێ نیشان دەدا.

زۆرجار کە لەبارەی مەسەلە ئامووزشی و رەوانی یەکانی منداڵانەوە قسەم بۆ گوێگران کردوە و دوایە وەڵامی پرسیارەکانی ئامادە بووانم داوەتەوە، هەموو جارێ گوێگرێکی کۆنەپەرست پەیدا بووە کە هەستێتەوە

بڵێ: «بابم لێدانێکی حەسێبیی لێ دەدام، پێشم وایە کارێکی باشی دەکرد. ئەگەر ئەو منی تەمبێ نەکردبایە، ڕەنگە ئێستا ئەوە نەبوایەم کە هەم». بەڵام من قەت ئەوەندەم مەرد ئازایی لە خۆمدا بەدی نەکردوە کە پێی بڵێم: «جا بۆ پێت وایە ئێستا بووی بە شتێک؟»

دەبێ قبووڵ کەین کە سزادانی منداڵان ئەوان تووشی زۆر زیانی دەروونی و کۆمەڵ تووشی زۆر خەساری بەرچاو دەکا. چونکە دژکردەوەکانی داهاتووی منداڵ لە کۆمەڵدا شوێنەواری ئەو ئاکار و کردەوانەیان پێوە دیار دەبێ کە بە چکۆڵەیی لە دایک و باب و دەوروبەریان دیوە. ئێمە ناتوانین قووڵایی ئەو زیان و زەرەرانەی منداڵانی تەمبێ کراو و سزادراو بە کۆمەڵی دەگەیەنن، دەست نیشان بکەین. ئەو زەبرە دەروونی‌یانەی بە هۆی سزادانەوە وەمنداڵان دەکەون، تا ڕۆژی مردن شوێنەواریان دەمێنێ و ئەوان دەکا بە کەسانێکی یاخی و دژ بە کۆمەڵ. زۆر لەوانەی نەخۆشیی جینسی‌یان هەیە و لەسەر شەقامەکان خۆیان ڕووت دەکەنەوە و ئەندامەکانی لەشیان دەردەخەن و لە ئاکامدا تووشی گیران و بەندیخانە دەبن، ئەو کەسانەن کە بە منداڵی لەسەر دەست وەردان لە ئەندامی جینسی‌یان تەمبێ کراون. لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا لە قوتابخانە جۆربەجۆرەکاندا کارم کردوە، تا ئێستا لە هیچ دایک و بابێکم نەبیستوە بڵێن: «ئێمە کوڕەکەی خۆمان تەمبێ کرد و ئێستا بووە بە منداڵێکی زۆر باش». بە پێچەوانە بە هەزاران جار گوێم لەو چیرۆکە تاڵە بۆتەوە کە: «هەر چی زۆرتر تەمبێی دەکەین خراپتر دەبێ». ئەو منداڵەی تەمبێ دەکرێ ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژێ خراپتر دەبێ و لەکاتی خۆیدا دەبێ بە دایک یان باوکێکی سەختگیر. بە منداڵی ڕەفتاری دایک و بابی لەگەڵ وی چۆن بووە، ئەویش هەر ئەو ڕەفتارەی لەگەڵ منداڵ یان منداڵەکانی خۆی دەبێ و ئەم وەزعە بەم جۆرە لە نەسلێکەوە دەگاتە نەسلێکی دیکە.

زۆرجاران لە خۆم دەپرسم بۆچی دایک و بابە تێگەیشتووەکان ڕێگا دەدەن لە قوتابخانە منداڵانیان تەمبێ بکرێن؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بێ کە وابیر دەکەنەوە منداڵانیان لەو ڕێگایەوە باشتر تەربیەت هەڵدەگرن. بەڵام ئەوان لە بیریان دەچێتەوە کە مامۆستای سەختگیر سەرنجی قوتابیانی بۆ لای تەمبێ ڕادەکێشێ نەک ئەو شتانەی لەسەر تەختەرەش نووسراون. لەراستی‌دا زۆربەی قوتابیان و خوێندکاران، دوای تەواو کردنی خوێندن واز لە توێژینەوە و لێکولینەوە دێنن و روو لە کاری دیکە دەکەن. خۆ ماندوو کردنی ئەوان لەکاتی خوێندن‌دا زۆرتر دەگەرێتەوە بۆ ئەو ترسەی لە مامۆستا و بەرێوەبەری قوتابخانە و سزا دیاری کراوەکانی ئەوان هەیانە. ئەو فشار و سزایەی مامۆستایان و بەرێوەبەرانی قوتابخانە لەسەر پێوەندی‌یەکانی منداڵان و دایک و بابەکانیش شوێن دادەنێ. چونکە لە روانگەی منداڵەوە هەر گەورەیەک لە جێی دایک و بابە. ڕەنگە ئەو حەقیقەتەمان پێ ناخۆش بێ بەڵام دەبێ بزانین هەر جارێک کە ڕاهێنەر منداڵێک تەمبێ دەکا، ڕق و بێزاری لە گەوران، کە دایک و بابیش لەوانن، لە منداڵ‌دا ڕەگ دادەکوتێ. هەربۆیە نابێ بەرامبەر بە تەمبێ کرانی قوتابیان لە قوتابخانەکان‌دا بێ لایەن بین و وابیر بکەینەوە کە ئەو تەمبێ کرانە شوێنێکی لەسەر ئاکار و هەڵس و کەوتی منداڵ لە نێو بنەماڵە دانابێ. منداڵ لەم جۆرە کاتانەدا پێی وایە دایک و بابی بەرپرسیارن و خوازیاری دەخالەت کردنی ئەوانە. تەمبێی جیسمیی منداڵان یەکێک لە دزێوترین کارەکانە کە هەتا ئێستاش هێندێک کەس بۆ بەرەوپێش بردنی مەبەستەکانیان کەڵکی لێ وەردەگرن.

سزادانێکیش کە شێوەی «موعظە» و سەرکۆنەکردنی هەیە زۆر پرمەترسی‌یە. کاتێک بە منداڵ دەگوترێ: «مەگەر نەت دەزانی ئەو کارە خراپە و نابێ بیکەی؟»، دەبێ بڵێی «لەو کارە پەشیمانم»، یان قسەی ئەوتۆی پێ دەگوترێ کە دەبنە هۆی ئازاردانی ویژدانی، لە پاڵە خۆی‌دا بە

دروولی هەستی بە خەتاکاری و تاوانباری دەکا. هەستێک کە بە زەحمەت بۆی تەحەممول دەکرێ. ئاکامێکی دیکەی ئەم جۆرە سزایە یانی سەرکۆنە کردنی بەردەوامی منداڵان ئەوەیە کە ئەوان دەکا بە ئینسانێکی ریاکار و دوو روو و جامە لووسکە.

خۆزگە ئەو کەسانەی کاریان پەروەردە و فێرکردنی منداڵانە و باوەریان بە توندوتیژی و تەمبێی جیسمی و سزاکانی دیکە هەیە، زیاتر لەو بارەیەوە بیریان دەکردەوە و بە تێگەیشتن لە زیان و شوێنەوارەکانی ئەم جۆرە کردەوانە، داهاتووی منداڵانیان لەگەڵ مەترسی بەرەوروو نەدەکرد.

## پیسایی و چۆنیەتیی راهێنانی منداڵان بە پاک و خاوێنی

لەگەڵ تێپەر بوونی رۆژگار و وەدەست هێنانی ئەزموونی زیاتر، ئەو راستی‌یەم باشتر بۆ دەرکەوتوە کە منداڵان سەرنجێکی زۆر دەدەن بە پیسایی خۆیان. لەو بارەیەوە تا ئێستا زۆر کتێب نووسراون و لە داهاتووش دا بێگومان دەنووسرێن. کچەکەی من ئەوکاتی ساوا بوو، پیسایی خۆی زۆر نەدەدایە بەر سەرنج و یاریی پێ نەدەکرد. بەڵام کاتێک پێی نایە تەمەنی سێ ساڵی، لەگەڵ کیژۆڵەیەکی چوارساڵەدا کە ببوون بە دۆست، یاریی کردن بە پیسایی خۆی دەست پێ کرد. کچەکەم یاری کردن بە پیسایی لەو کیژۆڵەیەی هاورێی - کە زۆر زوو ناچاریان کردبوو خۆی پاک و خاوێن رابگرێ و دەست لە پیسایی خۆی وەرنەدا- فێر ببوو. بەو مەسەلەیە زۆر قەڵس و توورە بووین. بەڵام کارێکمان لەدەست نەدەهات. چونکە هەرجۆرە دژکردەوەیەکمان نیشان دابایە، لەوانەبوو کچەکەمان زیاتر بۆلای ئەو کارە پاڵ پێوە بنێ. زۆری نەکێشا کچەکەمان وازی لەو کارە هێنا و دەست لە پیسایی وەردان قڕانایی هات.

گەورەکان زۆر بە زەحمەت هەست بەو مەسەلەیە دەکەن کە منداڵ نە پیسایی‌یەکەی خۆی پێ پیسە و نە بۆنێکی ناخۆشی لێ دەکات.ڕەفتاری هەڵنسەنگێندراوی گەورەکان لەو پێوەندی‌یەدا دەبێتە هۆی ئەوە منداڵ کردەوە و جووڵانەوەی ناتەواوانە نەک (متعادل) لە خۆی نیشان بدا.

وەبیرم دێ لەم دوایی‌یانەدا کچێکی یازدەساڵەیان هێنایە قوتابخانەکەی ئێمە. ئەو کچە هەموو هەست و هۆشی بەلای ئاودەستەوە بوو. بەردەوام لە هەوڵ دابوو لە کوونی دەرگای ئاودەستەوە بڕوانێتە ژووری ئاودەست. ڕۆژێک بانگم کرد و پێم گوت: پێت خۆشە لە جیاتی دەرسی جوغرافیا لە بارەی ئاودەستەوە قسەت بۆ بکەم. بەوپەڕی خۆشحاڵی‌یەوە وەڵامی دامەوە: بەڵێ. دەرزژان ئەو کارەم کرد. ڕۆژی دەهەم کە دەمەویست دیسان لەسەر ئاودەست قسەی بۆ بکەم، گوتی: پێم خۆش نیە چی دی لەو بارەیەوە بۆم بدوێی. لەوکات بەدواوە، هۆش و بیری لەسەر ئاودەست لاچوو.

قوتابی‌یەکی دیکەم ئۆگری هیچ دەرسێک نەبوو و تەنیا و تەنیا ئۆگری پیسایی‌و ئەو شتانە بوو کە شێوەی پیسایی دەدەن. دەمزانی هەتا ئەو خولیایەی لەسەردابێ، گرنگی بە خوێندن نادا. بە هەڵەش نەچوو بووم. لەو جۆرە کاتانەدا کارو ئەرکی ڕاهێنەر زۆر سادەیە. ڕاهێنەر دەبێ لە پێش‌دا ئەو شتە بدۆزێتەوە کەهەموو هۆش‌و بیری منداڵی بەخۆیەوە خەریک کردوە، پاشان یارمەتیی بدا تا لەو کردەوە دزێوە ماندوو ببێ و هۆش و سەرنجی خۆی چی دیکە پێوە خەریک نەکا. سەرکوت کردن، تەمبێ کردن و ترساندن و تەنانەت بێدەنگە لێکردن، منداڵ زیاتر بۆ لای عادەتە ناپەسەندەکانی ڕادەکێشێ.

دوا نموونە کە لەو دوایی‌یانەدا تووشی بووم کوڕێکی چکۆڵە بوو کە لەبەر ئەوەی هەموو جارێ خۆی پیس دەکرد، دایکی ناردبوویە قوتابخانەکەی ئێمە. دایکی بۆ ئەوەی کوڕەکەی ئەو عادەتەی تەرک بکا

چەندین جار لیی دابوو و تەنانەت ناچاری کردبوو پیسایی خۆی بخوا. بۆخۆتان لێکی دەنەوە کە ئەو مەسەلەیە مێشکی ئەو منداڵەی تووشی چ ئازارێکی گەورە کردبوو. من بۆم دەرکەوت کە ئەو منداڵە برایەکی لە خۆی چووکتری هەیە و بەدوای لەدایک بوونی وی‌دا تووشی ئەو گیروگرفتە هاتوە. هۆی ئەم کارەش زۆر روون بوو.ئەو کوڕە لە دڵی خۆی‌دا گوتبووی: «ئەو برا چکۆڵەیەم هەموو خۆشەویستیی دایکمی بۆلای خۆی راکێشاوە و ئەمن لە بیر چووەمەتەوە. ئەگەر ئەمنیش وەک وی بم و خۆم پیس بکەم، دایکم منیشی خۆش دەوێ».

ئەمن لەگەڵی کەوتمە قسە کردن تا هۆی ئەسلیی ئەم وەزعە بدۆزمەوە. دیارە لەو جۆرە کاتانەدا، رەنگە دەست بەجێ نەگەینە ئاکام و بۆ ئەم مەبەستە ماوەی زۆر پێویست بێ. زیاتر لە ساڵێک ئەو منداڵە، هەموو رۆژێ سێ‌جار خۆی پیس دەکرد. پەرستاری قوتابخانە، بێ‌ئەوەی لیی توورە بێ خاوێنی دەکردەوە و ئەمنیش هیچم وەسەر خۆم نەدێنا. دوای ماوەیەک هەر جار کە خۆی پیس کردبا، من خەلاتیشم دەدایە. مانای ئەو کارە ئەوە بوو کە کردەوەکەی تەئیید دەکەم. هەروەک گوتم ئەو کارە ماوەیەکی درێژی خایاند. چونکە کێشە و بێنە و بەرەی دەروونیی ئەو منداڵە زۆر قووڵ بوو و بۆئەوەی فێر بێ خۆی پاک و خاوێن رابگرێ، ماوەیەکی دوور و درێژ پێویست بوو. سەرەنجام دەستی لەو عادەتەی هەڵگرت و بوو بە کوڕێکی بەتەواوی پاک و خاوێن. سێ ساڵانیش بێ ئەوەی هیچ گیروگرفتێک بخوڵقێنێ لە قوتابخانەکەی ئێمە مایەوە و درێژەی بە خوێندن دا.

ئێمە دەتوانین بێ ئەوەی سەرنج دانی منداڵ بە کردەوەی خۆ سووک کردنی سروشتی، لە مێشکی‌دا سەرکوت یان سەقامگیر بکەین، فێری بکەین کە پیسایی بە خۆی دانەکا و جل و بەرگەکەی خاوێن رابگرێ. بەرخ و بێچوو پشیلە هیچ چەشنە گرێمانە و سەرنج دانێکیان لەبارەی

پیسایی خۆیانەوە نیە. بەڵام ئەگەر منداڵ لەو بارەیەوە گیروگرفتی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ تەربیەتی نادروستی وی. کاتێک دایکێک هێندێک ناوی ناشیرینی وەک: پیس، دزێو و ناحەز لەسەر ئەم کارە سروشتی‌یەی منداڵەکەی دادەنێ واتای چاکە و خراپە لە زەینی‌دا دەگۆڕێ و مەسەلەکە شێوەی ئەخلاقی بە خۆیەوە دەگرێ. لە حاڵێک‌دا ئەوە مەسەلەیەکی جیسمی‌یە نەک ئەخلاقی.

کەوابوو خراپترین دژ کردەوە بەرامبەر بەو کردەوەیەی منداڵان ئەوەیە کە پێ‌یان بگوترێ کارێکی دزێو و ناحەزتان کردوە. باشترین دژکردەوەش ئەوەیە کە ڕێگا بدەین خەریک بوونی بیر و هۆشی منداڵ بە پیسایی خۆیەوە، بە کایە کردن بە هەویر یان قوڕەسوور کۆتایی بێ و لەو کارە ماندوو ببێ. بەوکارە و هەروەها بە هەوڵدان بۆ ئەوەی منداڵ لە جیاتی پیسایی خۆی، یاری بە هەویر و قوڕ بکا، منداڵ بێ ئەوەی سەرەشکێنە کرابێ، یاری‌یەکانی خۆی دەکا و واز لە یاری کردن بە پیسایی خۆی دێنێ.

منداڵ پێی وایە پیسایی شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێش بۆ پشکنین و لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوەیە. ئەگەر بمانەوێ سەرنج دانی تایبەتیی منداڵ بە پیسایی، لە ڕێگای هەرەشە و فشار و دەرسی ئەخلاقەوە کۆتایی پێ بێنین، لەوانەیە بە ئاکامێکی زۆر نالەبار بگەین. ئەوە هەر منداڵان نین کە پیسایی و خۆخاڵی کردن هۆش و بیریان بە خۆوە خەریک دەکا. زۆر لەوانەی تەمەنێکیشیان لێ ڕابردوە لەوە کە گووەکەیان لە هی کەسانی دیکە گەورەترە، بەخۆیان دەنازن. لە ڕوانگەی «مادی»یەوە پیسایی بۆ وان بایەخێکی زۆری هەیە. ئەو دزەی بەدوای هەڵگرتنی کەل و پەلە بەنرخەکانی ماڵێک‌دا بەرلەوەی شوێنی دزی کردن بەجێ بێڵێ، لەسەر فەرش و ڕایەخی خاوەن ماڵ خۆی خاڵی دەکا، لەڕاستی‌دا نایەوێ بێ حورمەتی‌یەکی زیاتر بە خاوەن ماڵ بکا، بەڵکوو لە ڕوانگەی

ئەمادی‌یەوە نیشان دەدا کە هەست بە تاوانباری دەکا و دەیەوێ لە بەرامبەر ئەو شتانەی دزیونی، شتێکی بەنرخ بەجێ بێڵێ.

حەیوان سەبارەت بە کردەوەی هەڵرشتنی ئەوەی لە ریخەڵۆکەی دایە، بە تەواوی نائاگایە. بۆ وێنە سەگ و پشیلە بە شێوەیەکی غەریزی پیسایی خۆیان بە خاک و خۆڵ دادەپۆشن. رەفتاری ئەخلاقیی مرۆڤ سەبارەت بە پیسایی خۆی بێگومان لەگەڵ ئەو بەرنامە خۆراکی‌یە ناسروشتی‌یە کە کەڵکی لێ وەردەگرێ، لە پێوەندی دایە. پیسایی ئەسپ، مەر و کەروێشک خاوێن دەنوێنن و هەر لە جێدا بێز هەستێن نین. لە حاڵێکدا پیسایی ئینسان بە هۆی خواردنی خۆراکی دەسکرد بێز هەستێنە. ئەو بێزاری و رقەی گەورەکان لەو پێوەندی‌یەدا لە خۆیانی نیشان دەدەن لەوانەیە شوێنەوارێکی خراپ لەسەر روح و دەروونی منداڵان دابنێ.

## شیردانی ساوا و خواردن

رەفتاری ملهوڕانە بەرامبەر بە منداڵان هەر لە یەکەم ساتەکانی هاتنە سەر دنیایان و لەگەڵ دیاری کردنی ئەو سەعاتانەی بۆ شیردان بەوان دیاری دەکرێ، دەست پێ دەکا. شیردان بە منداڵی ساوا لە کات و ساتە دیاری کراوەکاندا کە ماوەیەکی زۆر بوو دوکتوران و پەرستاران لایەنگری‌یان لێ دەکرد، ئێستا بە جۆرێک دژایەتیی لەگەڵ دەکرێ کە ژمارەیەکی زۆر لە دوکتورانیش رەتی دەکەنەوە. چونکە ئەو کارە کارێکی بێ ئینسافانە وپرمەترسی‌یە. ئەگەر منداڵێک لەسەری سەعاتی چواردا برسی بێ و لە برسان بگری، بە پێی دابی شیردان لە سەعاتی دیاری کراودا، دەبێ سەعاتێک برسی بمێنێتەوە تا کاتی شیر پێ دانی دەگا. ئەوە بەرنامەیەکی سەخت و دژی ئینسانی‌یە. ساوا دەبێ بتوانێ هەرکات برسی بوو، شیر بخوا. لە رۆژەکانی یەکەمدا لەوانەیە چەندین کەرەت

پێویستیی بە شیر خواردن هەبێ. هۆیەکەشی ئەوەیە کە توانای ئەوەی نیە تێر بە زگی خۆی شیر بخوا. بەڵام پاشی سێ مانگ بەرە بەرە کاتی شیر خواردنی خۆی رێک و پێک دەکا و ئیدی شەوێ کە خەوت هەتا بەیانی پێویستیی بە شیر نابێ.

ئەگەر ساوا ئازادانە پەروەردە ببێ و بۆ خۆی کاتەکانی شیرخواردنی دیاری کردبێ، ئاکامەکەی ئەوە دەبێ کە دەبێتە منداڵێکی سەربەخۆ و دواتریش لە خواردنی خۆراکی دیکەدا لەگەڵ گیرو گرفت بەرەوروو نابێ.

ئەومنداڵانەی قامکیان دەمژن و تاچەند ساڵان ئەو کارە درێژە دەدەن، زۆرتر ئەوانەن کە لە کات و ساتی دیاری کراو دا شیریان دراوەتێ. وەختایەکی هەر لە رۆژی یەکەمەوە بایەخ بە غەریزەکانی ساوایان نادرێ ئاکامەکەی بوونی ئەو منداڵانە دەبێ کە لەگەڵ زۆر لە نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان بەرەوروون.

لە پانسیۆنی قوتابخانەکەمان‌دا، قوتابیان لە هەڵبژاردنی خواردن‌دا ئازادن. بەشێوەیەکی گشتی ئێمە هەموو رۆژێ لە قوتابخانەکەمان سێ جۆرە خواردن ئامادە دەکەین تا هەرکەس ئەو خواردنە بخوا کە پێی خۆشە. کاتێک منداڵان بەرنامەیەکی رێک و پێکی خواردنیان هەبێ، ئیدی بە ئاونەبات و بەستەنی نەخۆش ناکەون. زۆری کردن لە منداڵێک بۆ ئەوەی خواردنێکی تایبەتی بخوا، کارێکی چەوت و بێ مانایە. ئێمە هیچ کات کچەکان ناچار بە خواردنێکی تایبەتی ناکەین. ئەو هەمیشە ئەو مافەی هەیە بە گوێرەی پێخۆش بوونی خۆی خواردن هەڵبژێرێ. هەر کاتێک سەرمای بێ بێ ئەوەی ئێمە پێی بڵێین تا چا دەبێتەوە، بێجگە لە میوە هیچی دیکە ناخوا. ئەوەش لە حاڵێک دایە کە هەمیشە دەستی بە خواردەمەنیی جۆربەجۆری وەک میوە و «شکلات» و شیرینی رادەگا. بەڵام زۆریان حەز لێ ناکا. قوتووە شیرینی‌یەک لەوانەیە چەندین رۆژ لەسەر میزەکەی وەمێنێ بێ ئەوەی دەنکێکی لێ هەڵگیرابێ. کاتێک

لەسەر نان خواردنە ئەگەر هەڤاڵەکەی بێتە شوێنی، نانەکەی بەجێ دێڵێ و دەچێ بۆ لای هاڤاڵەکەی تا یاریی لەگەڵ بکا. بەوحاڵەش دەبێ بزانین منداڵان خواردنیان زۆر پێ خۆشە و دەبێ تا ئەو جێگایەی بۆمان دەکرێ وەڵامدەری ئەو ئۆگرییەی وان بین.

## خەو و تەندروستی

لە ماوەی سی و هەشت ساڵی رابردوودا، لە قوتابخانەی ئێمە کەم واهەبووە قوتابیان نەخۆش کەون. چونکە لە روانگەی ئێمەوە خۆشی و بەختەوەریی منداڵان لە رێژیی خواردەمەنی گرنگترە.

خواردنی سەوزی و میوە بۆ تەندروستی زۆر پێویستە. بەڵام ئەگەر هەموو سەوزی و میوەی ئەو دنیایە دەرخواردی منداڵێک بدەین کە لە باری رووحییەوە تەواو نیە، پێی چا نابێتەوە. ئەگەر کەسێک باشترین بەرنامەی خۆراکیش بۆ منداڵەکەی ئامادە بکا، بەڵام نەتوانێ خۆشی و بەختیاریی ئەو دابین بکا، ناتوانێ پێشگیری لە نەخۆش کەوتنی بکا.

خەویش بۆ منداڵانی ساوا هەر ئەو گرنگییەی هەیە. منداڵێکی ٧ ساڵە بەیانان دەچێتە قوتابخانە، نابێ رێگای پێ بدرێ هەتا درەنگانی شەوێ بەخەبەر بێ. چونکە کەمیی خەو زیانی گەورە بە تەندروستییەکەی دەگەیەنێ. بەڵام منداڵانی گەورەتر، ئەگەر کەیف خۆش و خۆش خۆراک بن، دەتوانن کەمیی خەو، قەرەبوو بکەنەوە و لەوانەیە ئەم جۆرە منداڵانە لە رۆژانی تەعتیلدا، تۆڵەی کەم خەوییەکەیان بکەنەوە.

سەبارەت بە پێوەندیی کار و تەندروستییش دەبێ بڵێم: بۆ ئێمە گەورەکان، کار نەخشێکی دوو لایەنەی هەیە. بۆ وێنە کاتێک ئەمن لەنێو باخچەکەمدا خەریکی پەرەڵماسی چەقاندنم دەزانم ئەگەر لە جیاتی ئەو کارە خۆم بە نووسینی وتار بۆ رۆژنامەیەکەوە خەریک بکەم، یان وەدوای توژینەوەیەک بکەوم، پوولێکی زیاترم دەست دەکەوێ. دەشتوانم

باخەوانێک بگرم بۆ ئەوەی لە جیاتی من بە باخچەکەم و پەروەڵماسی چەقاندن و ... رابگا. بەڵام ئەگەر ئەو کارە ناکەم و بۆ خۆم بە کاری باخەوانیی باخچەکەم رادەگەم هی ئەوەیە کە ساڵانێکی زۆر لە تەمەنم رابردوە و بایەخی تەندروستیی دەزانم و دەمەوێ بە ئەنجامدانی کاری باخەوانی، تەندروستیی خۆم بپارێزم. بەڵام منداڵان هەمیشە لە زەمانی حاڵدا دەژین و ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە پێیان خۆشە. ئەوان وەک ئێمە گەورەکان بیر لە تەندروستیی خۆیان ناکەنەوە و هیچ کارێک بەو مەبەستە ناکەن کە ببێتە هۆی پاراستنی تەندروستی‌یان. بە بڕوای من تەندروستیی منداڵان بە سێ هۆوە بەستراوەتەوە کە بە پێی گرنگی‌یان بریتین لە: ئازادی، خواردنی باش و هەوای خۆش.

## پاک و خاوێنی و جل و بەرگ

لە باری پاک و خاوێنیی فەردی‌یەوە، کچان زیاتر لە کوڕان بە خۆیان رادەگەن. کوڕان و کچان تا پازدەساڵی گرنگی‌یەکی ئەوتۆ بە جل و بەرگ و لیباسی خۆیان نادەن بەڵام لە دوای پازدە ساڵی‌یەوە گرنگی بە رواڵەت و لیباس دەدەن. ئەوان تا نەگەنە پازدە ساڵی خۆیان زۆر بە رێک و پێک کردنی ژوورەکانیانەوە خەریک ناکەن. کچان تا ئەو تەمەنە، زۆرتر پێیان خۆشە لەگەڵ بووکە باغەکانیاندا یاری بکەن و کراسیان بۆ بدروون.

لە پانسیۆنی ئێمەدا کەم هەڵ دەکەوێ قوتابی‌یەک خاوێن نەبێ، یان بۆ خۆی نەچێتە حەمام. جارێک کچێکی نۆساڵەیان هێنابوو تا لە قوتابخانەکەی ئێمە بخوێنێ. لە ماڵێ نەنکی ناچاری دەکرد رۆژێ دەجاران خۆی بشوا و هەمیشە پاک و خاوێن بێ. چەند رۆژ دوای هاتن بۆ قوتابخانە، ئەو کچە هەر کە زانی لێرە کەس بە زۆری نانێرنە حەمام و کەس نیە خۆش خۆش وەگوێی هەڵێنێ کە دەبێ خۆی بشوا، لە چوون بۆ

حەمام خۆی دەبوارد. ڕۆژێک ڕاهێنەری منداڵەکان هاتە لای من و گوتی ئەوە حەوتوویەکە ئەو کچە نەچۆتە حەمام و زۆر چڵکنە، چی لێ بکەم؟ پێم گوت: بی‌نێرە لای من.

بە دەست و پل و سەروچاوی لە چڵکدا ڕەش هەڵگەراوەوە هاتە لای من. پێم گوت: «بەو وەزعەوە ناتوانی لێرە وەمێنی».

بە قەڵسی‌یەوە گوتی: «پێم خۆش نیە خۆم بشۆم».

گوتم : «من لە بارەی خۆشوشتن و چوونە حەمام لە گەڵت نادوێم. هەر بۆ ئەوەم بانگ کردووی پێت بڵێم بچوو خۆت لە ئاوێنەدا ببینە».

سەیرێکی ئاوێنەی کرد. لێم پرسی: «خۆت پێ چۆن بوو؟»

بزەیەکی کەوتە سەر لێوان و گوتی: «دەم و چاوم زۆرخاوێن نیە. وانیە دەنا؟»

گوتم: «بە پێچەوانە، دەم و چاوت زۆریش جوانە و من نامەوێ کچێکی وەک تۆ خاوێن لەو قوتابخانەیەدا ڕابگرم. جا ئەم جار هەستە برۆ!»

کچەکە بەرەو ئەمباری قوتابخانە ڕای کرد و دەم و چاوی خۆی بە ڕەژی تەواو ڕەش کرد و بە فیزێکەوە گەڕایەوە لام و گوتی ئەوجار چابوو؟

بە وردی سەیرێکی دەم و چاویم کرد و گوتم: «نا، هێشتا جێ جێی خاوێن ماوە!»

هەر ئەوێ شەوێ چووە حەمام و خۆی پاک و خاوێن شوشت. لەو کات بەدواوەش بە ڕێک و پێکی دەچووە حەمام و هەمیشە پاک و خاوێن بوو. بەڵام حەمام کردنی لەمەودوای بە دڵخوازی خۆی بوو نەک بە فشاری ئەنکی.

ئەگەر دایکێک ڕێگا نادا منداڵەکەی یاریی بە خاک و خۆڵ بکا و دەترسێ جل و بەرگەکەی پیس ببێ، زۆرتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە

قسەی ئەو ناسیاو و دەرو جیرانانەی منداڵی وی لە جل و بەرگی خۆڵاوی‌دا دەبینن، دەترسێ. بڵێی لۆمەی دایکی ئەو منداڵە نەکەن و رەخنەی لێ نەگرن؟ لەو جۆرە کاتانەدا ترسان لە قسەی خەڵکی، دەبێتە هۆی ئەوەی دایک پێشی کایە کردنی منداڵەکەی بگرێ و لەو تام و چێژ و خۆشی‌یە بێ‌بەشی بکا کە منداڵ لە کایە کردن‌دا بەدیی دەکا.

سەبارەت بە هەڵبژادنی جل و بەرگ بۆ منداڵان لەسەر ئەو باوەڕەم کە جل و بەرگی منداڵی ساوا دەبێ دایک و باب هەڵی ببژێرێ. بەڵام منداڵانی گەورەتر دەبێ ڕێگایان پێ بدرێ بۆخۆیان جل و بەرگی خۆیان هەڵبژێرن و لەبەری بکەن. کچان دەبێ دەرەتانیان پێ بدرێ لە بارەی چۆنیەتیی داهێنان و رازاندنەوەی قژیانەوە بۆخۆیان بڕیار بدەن و کورتی و درێژیی قژیان بەدەست خۆیان بێ. هەڵبژاردنی جل و بەرگ بۆ منداڵان نابێ ببێتە هۆی ئەوەی ئەوان وابزانن زینداننیی جل و بەرگەکانیانن و چونکە جل و بەرگی نوێ و بە نرخیان لەبەردایە، مافی کایە و یاری کردنیان نیە. ئەگەر قەرار بێ منداڵ لە یاری نەکردن و لەبەرکردنی جل و بەرگی بە نرخ و نوێ بکەینە سەرپشک، واباشترە جل و بەرگی باشی بۆ نەکڕین، بەڵام دەرەتانی یاری کردنی هەبێ.

ئەو منداڵانەی سروشتێن هەر زگماک عەلاقەیەکی تایبەتی‌یان بە جل و بەرگەوە نیە. ئەوان لەوانەیە کۆت یان بلوزەکەیان لە جێ‌یەک دانێن و دوایەش وەبیریان نەیەتەوە و نەچنەوە سەری. بەڵام ئەگەر دایک و بابەکان لە پێوەندی لەگەڵ لەبەرکردنی جل و بەرگ‌دا رارابی و دوو دڵی‌یان هەبێ، ئەو تایبەتمەندی‌یە دەگەیەننە منداڵەکانیشیان. منداڵانێک کە ئەو تایبەتمەندی‌بانەی دایک و بابیان وەردەگرن ئەوانەن کە لە ترسی پیس بوون یان دڕانی جل و بەرگیان لە چوونە سەردار یان کایە کردن لەگەڵ منداڵانی دیکە خۆ دەبوێرن.

بەبروای من کایە کردن و خوشحاڵیی منداڵ لە جل و بەرگ کرنگترە

و لۆمە و قسە و قسەلۆکی خەڵک سەبارەت بە پیس بوونی جل و بەرگی منداڵێک، لەو خۆشی‌یە کە منداڵ لە کایە و یاری کردن دەستی دەکەوێ، زۆر کەمترە.

## ئامرازەکانی کایە پێ کردن (لەیستۆک)

ئەمن ئەگەر ئەقڵی کاسپی و بازرگانیم بوایە مسۆگەر دوکانی فرۆشتنی لەیستۆک (ئامرازی کایەی منداڵان)م دەکردەوە. ئەم رۆژانە ژووری منداڵان پڕن لە لەت و پەتی ئەو ئامرازانەی منداڵان کایەیان پێ دەکەن. منداڵانی چینی نێونجی زیاد لە رادەی پێویست ئامرازی یاری پێ کردنیان هەیە. بە بڕوای من کڕینی ئامرازی گرانبایی یاری پێ کردن بۆ منداڵان، دەناوێ کردنی پووڵە و هیچی دیکە.

ئەوکات کە کچەکەم چووکە بوو، یەکێک لە قوتابی‌یە کۆنەکانی قوتابخانە بووکە باغەیەکی دابوویە کە دەی‌توانی بڕوا و قسان بکا. دڵنیـــام ئەو بووکـــە باغـــەیە پووڵێکی زۆری پێ درابوو. هەر لەو سەروبەندەدا، یەکێکی دیکە لە قوتابی‌یەکان کەروێشکێکی بەدیاری پێ دابوو کە لە پەڕۆ ساز کرابوو و زۆر هەرزان و کەم نرخ بوو. کچەکەم نزیکەی نیوسەعات یاری بە بووکە باغەکە کرد و لێی وەڕەز بوو. بەڵام کەرویشکەکەی ئەوەندە بەدڵ بوو کە چەند حەوتوو کایەی پێ کرد و شەوانەش لەگەڵ خۆی دەی‌خەواند.

چەند ساڵ لەمەوبەر پرسیارنامەیەکم دا بەو قوتابی‌یانە کە تەمەنیان لەوانی دیکە زیاتر بوو و لێم پرسیبوون: «کەنگێ زیاتر لە هەموو کاتێک لە خوشک یان برای چووکەتان تووڕە دەبن؟» زۆربەی زۆریان لە وەڵامدا نووسیبوویان: «ئەوکاتەی ئامرازەکانی یاری پێ کردنمان لێ دەشکێنن».

پێویست نیە شێوەی کارکردنی لە یستۆکەکان فێری منداڵان بکەین.

دەبێ لێیان گەڕێن بۆخۆیان شێوەی کارکردنیان بدۆزنەوە. هەر لە جێدا دەبێ مەودا بە منداڵان بدەین ئەو کارانەی لە توانایان دایە، بۆخۆیان ئەنجامیان بدەن. مەگەر ئەو کاتەی کە لە توانایان دانیە و داوای یارمەتی دەکەن. منداڵانی سەربەخۆ ماوەیەکی زۆر خۆیان بە ئامرازێکی یاری پێ کردنەوە سەرگەرم دەکەن و نە دەیشکێنن، نە لە کەلکی دەخەن. ئەوان هەموو رۆژێ ئامرازێکی تازەیان ناوێ. ئەگەر منداڵانی چووکە ویستیان بە کەل و پەلی ئاشپەزخانە وەک کەوچکی دار و قابلەمە یاری بکەن نابێ پێشیان پێ بگرن. رەنگە ئەو جۆرە کەل و پەلانە لەو ئامرازانەی بۆ سەرگەرم کردنی منداڵان لە بازار دەفرۆشرێن، زیاتر سەرنجی هێندێک منداڵ راکێشن.

دایک و بابەکان زیاتر لە رادەی پێویست، لەیستۆک بۆ منداڵانیان دەکرن. هەر کە دیتیان منداڵەکەیان دەستی بۆ بووکە باغەیەک یان هەر ئامرازێکی دیکەی یاری پێ کردن برد دەست بەجێ بۆی دەکرن. هەر بۆیە ژووری منداڵان پڕ دەبێ لەو ئامرازانە کە زۆریان ئوگرنین. هێندێک ئامرازی دیکەی یاری پێ کردن هەن کە بۆ وەکار خستنی بیرو هۆشی منداڵانن. بۆ وێنە ئەو شوروڵ و خشتانەی کە خانوویان پێ دروست دەکرێ. بەڵام لەباری جۆراوجۆری‌یەوە زۆرنین. بەهەرحاڵ من توانای داهێنانی هیچ چەشنە ئامرازێکی فیکریم نیە بەڵام دڵنیام دنیای منداڵان پێویستی بە داهێنەرێک هەیە کە دڵ و دەروونی منداڵان لەو کەسانەی ئێستا ئامرازی یاری بۆ منداڵان دروست دەکەن، باشتر تێ بگا.

## زاق و زرووق

زاق و زرووق بەشێکە لە سروشتی منداڵان و،دایک و بابەکان دەبێ هەست بەم راستی‌یە بکەن و پێی رابێن. بۆ ئەوەی منداڵ بتوانێ بە شێوەی سروشتی گەورە بێ، دەبێ رێگای زاق و زرووقی لێ نەبەسترێ.

چل ســـاڵە من لە نێو زاق و زرووقی منداڵاندا دەژیم. دیارە ئەو وەزعە بۆ من بۆتە شتێکی ئاسایی. هەروەک کەسێکی لە بازاڕی مزگەراندا کار دەکا و لە بەیانییەوە تا ئێواریێ گوێی لە تەق و کوتی مزگەران دەبێ، یان کەسێکی لە ناوەندی شاردا دەژی، گوێی بە هەراو هوریا و تەق و کوت و هاڕەی ماشێنان رادێ. تەق و کوتی مزگەران و هاڕەی ماشێنان، هەمیشە یەک حاڵەتی هەیە، بەڵام زاق و زرووقی منداڵان گۆڕانی تێدایە و شوێن دادەنێتە سەر دەمارەکان. دەبێ پێ لەو راستییە بنێم چەند ساڵ لەمەوبەر کاتێک شوێنی حەسانەوەی خۆم لە ساختومانی ناوەندی کە شوێنی ژیانی منداڵان بوو، گوێزتەوە بۆ دیوێک لەو سەری باخ، ئارامی و بێدەنگیی شەو، لە پاش ساڵانێکی زۆر ژیان لە نێو زاق و زرووقی پەنجا منداڵدا، بەراستی خۆش و دڵگر بوو.

ساڵۆنی نان خواردنی قوتابخانەکەمان، بەراستی شوێنێکی پڕ هەراو هوریایە. منداڵانیش وەک گیاندارانی دیکە لەکاتی خواردندا دەنگەدەنگیان زۆرە. مامۆستایانی قوتابخانە زۆریان کەیف بە زاق و زرووق نایە. بەڵام قوتابییە گەورەکان هەر وەک ئەوەیە دەنگە دەنگی چووکەکان نەبیسن.

منداڵانی چووکە لە کاتی یاری کردنیشدا هەرا و هوریایان زۆرە. بەداخەوە لە زۆربەی قوتابخانەکان دەنگە دەنگ و هەرا و هوریاش وەک کایە کردن پێشی دەگیرێ. هەرا و هوریا و کایە کردن دووانەی یەکترین و منداڵانی حەوت تا ١٤ ساڵە بەراستی کەیفیان پێ دێ. بەڵام لە رۆژگاری ئێستادا بەو هۆیە کە زۆربەی خەڵک لە ئاپارتمانی بچووک و لەشاری گەورە و پڕ لە هەرا و هوریادا دەژین، زاق و زرووقی منداڵان تەحەممول ناکەن. لە وەزعێکی ئاوادا بردنی منداڵان بۆ دەرەوەی شارەکان لە رۆژانی بیکاریدا و ئازادکردنیان لە کایەکردن و وەڕێ خستنی زاق و زرووق لە داوێنی چیا و دەشتدا، دەتوانێ ئەو کەمایەسییەی وان تا

رادەیەکی زۆر قەرەبوو بکاتەوە.

## رێ و شوێنی پێکەوە ژیان (آداب معاشرت)

لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا، هەرکەس بۆ پێوەندی گرتن و هەڵس و کەوت لەگەڵ کەسانی دیکە، رەفتاری تایبەت بە خۆی هەیە. کاتێک دەڵێن فلانەکەس رەفتارێکی باشی هەیە، مەبست ئەوەیە کە هەوڵ دەدا دڵی کەس لە خۆی نەیەشێنێ و رێز لە خەڵکی بنێ. رەفتارێکی لەوچەشنە لە تایبەتمەندی‌یە سروشتی‌یەکانی مرۆڤە و بە فێرکردن لە مرۆڤ‌دا پێک نایە.

بەڵام ناسینی داب و نەریتەکانی پێکەوە ژیان پێوەندیی بە بەشی ئاگای مێشکەوە هەیە و دەکرێ فێریش بکرێ. رێ و شوێنەکانی پێکەوە ژیان لەراستی‌دا رازێنەرەوەی رەفتاری مرۆڤن. داب و نەریتەکانی پێکەوە ژیان فێرمان دەکەن لەبەر خانەکان هەستین. لە سینەما و لە کاتی دانیشتن لە ریزی بینەرانی شانۆ و لەکاتی بەرێوەچوونی کونسێرتی موسیقادا، پێکەوە قسان نەکەین، ئەگەر کەسێک یارمەتیی داین، سوپاسی بکەین و ئەگەر لە پێوەندی لەگەڵ کەسێک‌دا تووشی خەتایەک هاتین داوای لێبوردن بکەین.

رەفتاری ناحەز هەمیشە لە ئاڵۆزیی دەروونیی ئینسانەوە سەرچاوە دەگرێ. هەڵبەستنی بوختانی بەناحەق، بەدناو کردنی کەسانی دیکە و گوتنی خراپەی خەڵکی، لە ئاڵۆزیی ئەو کەسەی کارەکە دەکا، سەرچاوە دەگرێ. کەسێکی ئاوا دەیەوێ وابنوێنێ کە لە خۆشی بێزارە. ئەگەر ئێمە هەل و مەرجێک بۆ منداڵان بخوڵقێنین کە تێی‌دا هەست بە رەزامەندی و بەختیاری بکەن، هەموو جۆرە رق و بێزاری‌یەکیان لێ دوور دەخەینەوە.

لەو دوایی‌یانەدا، لە لەندەن لە کونفرانسێک‌دا قسەم بۆ خەڵک دەکرد. پیاوێکی بەساڵداچوو لەوە بە گلەیی بوو کە منداڵانی ئەم

رۆژگاره بەو جۆرەی پێویستە ڕێز لە گەوران نانێن. ئەو پیاوە دەی‌گوت چەند رۆژ لەمەوبەر لە پارکێک پیاسەم دەکرد، دوو منداڵ بە تەنیشتم‌دا ڕەت بوون و پێ‌یان گوتم: «کابرا چۆنی!» لێم پرسی ئەو قسەیە چی تێدایە کە بۆتە هۆی دڵ‌ئێشانت؟ بێگومان وات پێ باش بوو کە پێت بڵێن: «بەیانیت باش ئاغا!» لەڕاستی‌دا تۆ پێت وایە ئەو منداڵانە بە وتنی «کابرا چۆنی!» سووکایەتی‌یان پێ کردووی و چاوەڕوانی‌یەکی بە جێت لەوان نیە. بەڵکوو دەتەوێ لە بەرامبەر تۆدا ڕەفتارێکی کۆیلانەیان هەبێ.

من ئیتروومە کە منداڵان لە فێر بوونی داب و نەریتەکانی پێکەوە ژیان‌دا، یارمەتیی یەکتر دەدەن. قوتابیانی قوتابخانەی ئێمە گاڵتەیان بە یەکێک لە دۆستانیان کردبوو کە لەکاتی نان خواردن‌دا تەقەی لە ددانی دێنا. هەروەها لە بەرامبەر قوتابی‌یەکی دیکەدا کە ویستبووی بە کەوشی قوڕاوی‌یەوە بێتە ژوورەکەیان، ڕاوەستابوون و پێ‌یان گوتبوو ئەو ژوورە هی هەمووانە و ئەو هەقی نیە لێ‌یان پیس بکا.

ئەمن پێم وایە پێویست نیە منداڵان فێرکەین کە چۆن لەگەڵ کەسانی دیکە بجووڵێنەوە. چونکە بۆخۆیان لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان بەرە بەرە فێر دەبن. منداڵ دەبێ ئەو ئیجازەیەی هەبێ بۆ وێنە ئەگەر ویستی بێ کەوچک خواردن بخوا، ئەو کارە بکا. قەت نابێ داوای لێ بکەین چونکە پوور یان پلکی میوانیانە، ئەم ڕەفتارەی هەبێ یان فلانە کار نەکا. با لە ترسی ئەوە کە «دۆستان و خزمان چمان پێ دەڵێن و چۆنمان باس دەکەن» منداڵ لەبەردەم خزم و دۆست‌دا چووکە نەکەینەوە. سەبارەت بە چۆنیەتیی ڕێزگرتنی مامۆستایانیش لەو بڕوایەدام کە ئەگەر ڕێزدانان لە ترسانەوە بێ، یان لە پێناوی نومرەی چاک دابێ، هیچ بایەخێکی نیە. بەڵام ئەگەر منداڵان لە ڕووی سەداقەتەوە ڕێزی مامۆستا بگرن و خۆشیان بوێ، ئەوە شتێکی تەواو بە جێ و بەنرخە. منداڵانی قوتابخانەی ئێمە هەر کاتێکی

پێیان خــۆش بێ دەتوانـن پێم بڵێن «گــێژە». بەڵام ڕێزم بۆ دادەنێن، چونکە بەرێزەوە لەگەڵیان دەجووڵێمەوە. ئەمن و قوتابیان ڕێز بۆ یەکتر دادەنێین و قسەی یەکتر بە هێند دەگرین. ئێمە لە قوتابخانە قوتابیان بۆ گوتنی «سوپاس» و «تکایە» لە تەنگانە ناخەین. چونکە دڵنیاین کە منداڵان بێ ئەوەی ئێمە ناچاریان بکەین بەرە بەرە فێری بەکارهێنانی ئەو جۆرە وشانە دەبن. مەسەلەی گرنگ ئەوەیە کە نابێ بە زۆر و زۆرداری منداڵان فێری بەجێ هێنانی ڕێ و شوێنەکانی پێکەوە ژیان و هێندێک وشەی وەک «سوپاس» و «تکایە» بکەین. چونکە لەوانەیە ئەم وشانە بێ وەخت و وەک عــادەت و بێ ئەوەی باوەڕیان پێ هەبێ بەکــار بێنن. بەڵام کاتێک پێویستە بە فریای لێقەوماوێک بگەن ئەو کارە نەکەن. لە حاڵێکدا ئەگەر بگەنە پلەیەکی پێویست لە هەست پێکردن و تێگەیشتن، هەرکات یەکێک لە کارێکدا یارمەتییان بدا، سوپاسی لێ دەکەن و هەروەخت بزانن یەکێک پێویستیی بە هاوکاری و یارمەتیی ئەوان هەیە، دەفریای کەون. لە حاڵێکی ئاوادا دیارە قسە و کردەوەی منداڵ ڕواڵەتی نیــە و ســروشــتی و لــە دڵەوەیەو دەبێتــە هۆی پتــەو بوونی پێوەندیی ڕاستەقینەی ئینسانی و دۆستانە.

لە ڕوانگەی دایک و بابەکانەوە داب و نەریتەکانی پێکەوە ژیان، یان بە وتەیەکی دیکە، بە تەربیــەت بوونی منداڵانیــان، یەکــێک لە گرنگترین مەسەلەکانە. کەچی لە ڕوانگەی منداڵانەوە جۆری ڕەفتار و ڕێ و شوێنەکانی پێکەوە ژیان بایەخێکی ئەوتۆیان نیە. ڕێ و شوێنەکانی پێکەوە ژیان لای گەورەکان مانا و واتای تایبەت بە خۆیان هەیە و ئەوان هەوڵ دەدەن لەگەڵ کەسانی هەر چین یان توێژێکی تایبەتیدا بە شێوەی خۆی ڕەفتار بکەن. بۆ وێنە هەڵس و کەوت لەگەڵ مامۆستایەک، یان دوکتورێک و کرێکارێکی شارەداری لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا جیاوازییان هەیە. ئەوە لە حاڵێک دایە کە منداڵان حەز دەکەن لەگەڵ

هەموو ئەندامانی کۆمەڵ، یانی لەگەڵ کرێکار و ماموستا و فێرکار و کەسانی دیکەدا وەک یەک رەفتار بکەن. من وام پێ باشە ئێمە لە منداڵان گەڕێین تا بۆ خۆیان لە رەوتی گەورە بوون و شارەزا بوون لە فەرهەنگ و شارستانەتیدا، بۆخۆیان فێری داب و نەریتەکانی پێکەوە ژیان و رەفتاری کۆمەڵایەتی بن و بەسەداقەتێکی زیاترەوە لە ژیانی کۆمەڵایەتیی خۆیاندا بەکاری بێنن.

## خەرجی گیرفان

لە روانگەی زۆربەی منداڵانەوە دراو (پووڵ) سەمبولی ئۆگری و خۆشەویستییە. منداڵ پێی وایە چونکە دایکی دە تمەنی داوەتێ بەڵام باوکی بیست تمەن، کەوابوو باوکی زیاتر لە دایکی ئەوی خۆش دەوێ. دایک و بابەکان کە بە شێوەی سروشتی هەست بەو مەسەلەیە دەکەن، زیار لە رادەی پێویست دراو دەدەن بە منداڵانیان و ئەوان رووهەڵماڵاو فێردەکەن. ئەو منداڵەی خۆشەویستیی دایک و بابی هەست پێ ناکا، زۆرجار بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەم بوونی خۆشەویستی، دراوی زیاتر وەردەگرێ.

ئێمە هەموومان لە ژێر شوێنەواری بایەخی پووڵ داین و شوێنەوارەکەی لە کۆمەڵ و دەور و بەری خۆماندا هەست پێ دەکەین. زۆر جاران ئەو نەزم و رێ و شوێنەی دایک و بابەکان لە نێو بنەماڵەدا سەقامگیری دەکەن پێوەندیی بە نرخ و بایەخی شتەکانەوە هەیە و دەیانەوێ بەم شێوەیە منداڵانیان ناچار بە پاراستنی کەل و پەلە بە نرخەکان بکەن.

زۆر جار دایکەکان دەڵێن: منداڵەکەمان بە هەموو زێڕ و گەوهەری دنیایە ناگۆڕینەوە. بەڵام کاتێک منداڵەکەیان گوڵدانێکی بێ‌قیمەت دەشکێنێ، چینێکی حیسێبی دەکوتن. لێدان و کوتان سەبارەت بە

شکاندن و لە کەلک خستنی کەل و پەل، بە گشتی تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ منداڵاندا کەلکی لێ وەردەگیرێ. لە بیرمە ئەو کاتەی چکۆلە بووم هەرچەندجاری قاپێکم شکاندبایە دایکم تەمبێی دەکردم. بەڵام ئەگەر بابم شکاندبای دەی‌گوت: دەڵێی چی، کارە و قەوماوە.

زۆر لە دایک و بابەکان بە مەسەلەی پارە و بایەخ و نرخی کەل و پەلەکانەوە منداڵانیان تووشی دڵەراوکێ و نیگەرانی دەکەن. زۆرجار دەبیستری کە منداڵێک سەبارەت بەون کردن یان شکاندنی سەعاتەکەی ئارا و قارای لێ هەڵگیراوە و نازانێ چۆن ئەو رووداوە بە ئاگاداریی دایک و باوکی بگەیەنێ.

جاری واشە پێچەوانەی ئەو رووداوە دێتە پێش و منداڵان، هەر بۆ ئەوەی سەرنجی دایک و بابیان راکێشن بە ئەنقەست هێندێک شت دەشکێنن تا لەم رێگایەوە سەرنجی ئەوان بۆ لای خۆیان راکێشن. هێندێک جاریش منداڵان کە هەست دەکەن خۆشەویستی دایک و باوکیان نین، پەنا دەبەنە بەر شکاندنی کەل و پەلی بە نرخ تا لەو رێگایەوەداخی دڵی خۆیان بە دایک و بابیان برێژن.

لە قوتابخانەی ئێمە، هێندێک لە قوتابیان دراوێکی کەم و هێندێکیشیان دراوێکی زۆریان لە دایک و بابیانەوە پێ دەگا. ئەوە بۆ من بۆتە گیروگرفتێکی گرنگ و نازانم چۆن چارەی بکەم. ئێمە زۆرتر لە رۆژانی دووشەممودا، هەر قوتابی‌یەی پوولێکی وەک خەرجی گیرفان دەدەینێ. ژمارەیەکیان بێجگە لەو پوولەی لە ئێمەی وەردەگرن، لە دایک و بابیشیان برێک پارە وەردەگرن. ئەوە لە حاڵێکدایە کە ئەوانی دیکە لە لایەن دایک و بابیانەوە یان هەر هیچ پوولێکیان نادرێتێ، یان ئەوەی دەیان درێتێ زۆر کەمە. هەر بەو هۆیەوە و بۆ ئەوەی خەرجی گیرفانی هەمووان وەک یەک وابێ، لە کۆبوونەوە گشتی‌یەکانی قوتابیاندا کە حەوتووی جارێک پێک دێ، زۆر جاران پێشنیاریان پێ دەکەم کە

پووڵەکانیان تێکەڵی یەک بکەن و هەموو بە یەک رادە لێی هەڵگرن. شێر و رێوی‌یان بۆ دێنمەوە کە ئەوە ناعەداڵەتی‌یە قوتابی‌یەک دە پاوندی هەبێ و قوتابی‌یەکی دیکە پاوندێک. بەڵام پێشنیارەکەی من تا ئێستاش قبووڵ نەکراوە و هەموو جارێ دژایەتیی کراوە. ئەوانەی پووڵەکەیان کەمترە، پێیان خۆش نیە ئەوانەی پووڵی زیاتریان هەیە، پووڵەکەیان لەگەڵ وان دابەش بکەن.

بە بڕوای من واباشترە لە جیاتی پووڵی زۆر، پووڵێکی کەمتر بدرێ بە منداڵان. ئەو بابەی پووڵێکی زۆر دەنێتە بەر دەستی منداڵەکەی مەگەر بۆ مەبەستێکی تایبەتی بۆ وێنە کڕینی دووچەرخە و یان شتێکی بەنرخی دیکە بێ، ئەگینا کارێکی عاقڵانە ناکا..دانی پووڵی زۆر بە منداڵ، بۆ ئەوەی هەر جۆرێکی پێی خۆشە خەرجی بکا، کارێکی چاک نیە و دەبێتە هۆی رووهەڵماڵاو بوونی منداڵ و هەموو شتێکی لەبەرچاوی دەکەوێ.

هێندێک جار لەوانەیە پووڵی زۆر ببێتە هۆی کەم توانایی و لاوازیی منداڵ لە پەروەردەکردنی بیر و هۆشی‌دا. بۆ وێنە کاتێک بەلەمێکی چکۆڵەی بۆ دەکڕن تا کلیەی پێ بکا، ئەو خۆشی‌یەی لێ دەستێنن کە لە دروست کردنی بەلەمێکی دارینی دەستکردی خۆی دەستی دەکەوێ. کچێکی چکۆڵە ئەو بووکەی بۆخۆی لە پەڕۆ و پاڵ دروستی دەکا لەو بووکە باغە بەنرخەی ئێمە بۆی دەکڕین، بەلاوە خۆشەویستترە و فەرامۆشیی زیاتر، بەویان دێ. کەوابوو دەبێ لە بیرمان بێ خەرجی زۆری گیرفان لە خۆی‌دا، گیرو گرفتێکی منداڵ چارەسەر ناکا و لەوانەیە هێزی بیرکردنەوەش لاواز بکا.

## گاڵتە و جەفەنگ

بەداخەوە لە قوتابخانەکان و گۆڤارە ئامووزیشی‌یەکان‌دا زۆر بە کەمی کەلک لە بابەتی پێکەنینی و قسەی خۆش وەردەگیرێ. دەزانم

گاڵتەی بێ جێ لەوانەیە هێندێ مەترسیی بە دواوە بێ و هێندێک کەس بیانەوێ لە ڕێگای بەفشە گرتنی مسەلەکانی ژیانەوە، باری بەرپرسایەتی لە سەر شانیان لابەرن. چونکە بە فشە گرتنی مەسەلەکان لە رووبەروو بوونەوە لەگەڵ گیروگرفتەکان زۆر هاسانترە. بەڵام منداڵان لەبەر ئەو مەبەستە نیە کە پەنا دەبەنە بەر جەفەنگ و قسەی خۆش. ئەوان زۆرتر بە مەبەستی پتەوتر کردنی دۆستایەتی و زیاتر ناسینی یەکتر قسەی خۆش و گاڵتە لەگەڵ یەکتر دەکەن. مامۆستا ڕەزاگرانەکان هیچ کات لە ڕێگای گاڵتەوە هەوڵی باشتر حاڵی کردنی قوتابیان لە دەرسەکانیان نادەن. ئەمن بۆ خۆم لە ماوەی فێرکردن و بارهێنانی منداڵان لە هەل و مەرجە جۆراوجۆرەکاندا، هەتا ئەو جێیەی بگونجێ لە گاڵتە و قسەی خۆش کەلک وەردەگرم.

دایک ، یان باوک یان ڕاهێنەر ئەگەر بیانەوێ لە هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵاندا گاڵتە و جەفەنگ بەکار بێنن، دەبێ لە هەست و بیری منداڵانەی ئەوان تێبگەن. بۆئەوەی گاڵتەی ئێوە تێبگەن، بەر لە هەر شت دەبێ هەست بەوە بکەن کە ئێوە خۆشتان دەوێن. دیارە گاڵتەی ئێوەش نابێ بە خۆداشکاندنەوەی ئەوانی تێدابێ.

لێکۆڵینەوە لە ڕەوتی تێگەیشتنی گاڵتە لە لایەن منداڵانەوە بەراستی شتێکی سەرنج ڕاکێشە. ڕۆژێک لە حەوشی قوتابخانە رووم کردە قوتابی‌یەکی سێ ساڵە کە ناوی «داوید» بوو، گوتم: «ئەمن بۆ کارێک هاتوومە ئێرە و دەمەوێ بەرێوەبەری قوتابخانە ئاغای نیل ببینم! تو پێی نازانی؟» بە جۆرێک سووکایەتی پێ کردنەوە لێی ڕوانیم و گوتی: «گێژی خودای، نیل بۆ خۆتی.»

کاتێک تەمەنی گەیشتە ٧ ساڵی ڕۆژێکی بانگم کرد و بە شێوەیەکی زۆر جیددی پێم گوت: «دەستبەجێ دەچی بە داوید (یانی خۆی) دەڵێی بێتە دەفتەرەکەم، کارم پێیەتی! وابزانم ئەوە لەو سەری

[illegible] باری کردنە.» داوید بزەیەکی هاتێ و گوتی: «ئەوە دەچم
[illegible] دەکەم». بەغار خۆی گەیاندە ئەوسەری باغ و دوو دەقیقە
[illegible] هاتەوە و بە پێکەنینێکی جەفەنگ بازانەوە گوتی: «پێی ناکرێ
[illegible] گوتم: «بۆ پێی ناکرێ.» لە وەلاّم دا گوتی: «چونکە خەریکی تیز کردنی بەبرەکەیەتی!» لەگەڵ داوید دەمتوانی ئەو جۆرە گاڵتانە بکەم بەلاّم ئەو قوتابی‌یە تازانەی لە قوتابخانەکانی دیکەوە دێنە ئێرە، بەو جۆرەی پێویستە مانای گاڵتە و جەفەنگ حاڵی نابن. «رەیموند» قوتابی‌یەکی ۹ ساڵە بوو، تازە هاتبووە قوتابخانەکەمان، رۆژێک پێم گوت: «رەیموند لە قسان دەرگای هاتنە ژووری باغەکەت دزیوە! هەر بۆیە دەبێ جەریمەت بکەین!» ئەو کە هەر لە جێدا لەو گاڵتەیە حاڵێ نەببوو ملی لە گریان نا. بۆم دەرکەوت کە کارێکی هەڵەم کردوە. پاش دووساڵاّن کە شارەزای قوتابخانەکەمان بوو، ئەوجار لە مانای گاڵتەکە حاڵی بوو. کاتێک من لە قوتابی‌یەکی سێ ساڵە کە پانسیونی قوتابخانەکەمانە دەپرسم دەمەوێ بچمە دەفتەری قوتابخانە، تکایە پێم بڵێ بە کوێدا بڕۆم، پێکەنینێک دەی‌گرێ دەست و لاقی بەبڕی نایەتەوە سەرخۆ. بەلاّم کاتێک هەر ئەو پرسیارە لە کچانی حەوت ساڵە دەکەم. چونکە دەزانن بە فشەمە، ڕێگای پێچەوانەم نیشان دەدەن.

کچانیش بەقەت کوڕان کەیفیان بە فشە و جەفەنگ دێ ، بەلاّم کەم وا هەیە بۆ دیفاع لە خۆیان بە کاری بێنن. کوڕان هەوڵ دەدەن ئەو کاتانەی لە چارەسەر کردنی گیروگرفتێک دادەمێنن پەنا بەرنە بەر جەفەنگ و بەم جۆرە بەرەی خۆیان لە ئاوێ دەرکێشن. بەلاّم کچان کەمتر ئەو کارە دەکەن.

گەورەکان نابێ لەو کاتانەدا کە منداڵ بەراستی نارەحەتە فشەی لەگەڵ بکەن و بی‌رەنجێنن. ئەگەر منداڵ لە مەسەلەیەک کە پێی وایە بۆتە هۆی ناعەداڵەتی، نارەحەتە، هەوڵ بدەن بە شێوەیەکی جیددی

گیروگرفتەکەی بۆ چارەسەر بکەن. لە کاتی ئاوادا لەوانەیە گاڵتە کردن ئاکامی پێچەوانەی هەبێ. کاتێک منداڵێک لەرز و تایەکەی گەیشتۆتە پلەی ٣٩، ناکرێ چیرۆک و قسەی خۆش لە بارەی نەخۆشی و مردنی بۆ بگێڕینەوە. منداڵان لە کاتی گونجاو و لەباردا گاڵتە و قسەی خۆشیان پێ خۆشە. چونکە هەم دەیان خاتە پێکەنین و هەم واهەست دەکەن کە گەورەکان خۆشیان دەوێن. یەکێک لە تایبەتمەندی‌یە باش و بەکەڵکەکانی قوتابخانەی ئێمە ئەوەیە کە لە وەخت و کاتی لەباردا پەنا دەبەینە بەر گاڵتە کردن و ئەوەندەی بکرێ کەلکی لێ وەردەگرین.

# فەسڵی سێهەم:

## مەسەلە جینسی یەکان

* شارەزا کردنی منداڵان لە مەسەلە جینسی یەکان
* دەستپەڕ (استمناء)

## شارەزا كردنی منداڵان لە مەسەلە جینسی‌یەكان

زۆر لە دایک و بابەكـان لە جـیـاتـی وەڵام دانەوەی پرسـیـاری منداڵانیـان لە بارەی مـەسـەلە جینسی‌یەكانەوە باس لەو بوارەدا بە تاوان و گوناح دادەنێن و لەسەر چووكترین پرسیار لەو پێوەندی‌یەدا، ئەوان تەمبێ دەكەن. ئەو منداڵانەی بەم شێوەیە پەروەردە كراون، لە بواری جینسی‌دا هەمـیـشـە خـۆیان بە تاوانبـار دەزانن و لە ژیانی ژن و مـێردایەتی‌دا سەركەوتوو نابن. گەورەكان لەوانەیە لە رەوتی گەورە بوون‌دا شارەزای زۆر لە مەسەلە جینسی‌یەكان بن و ئەو بیرە نادروستانەی بە منداڵی چۆتە مـێشكیـان، لە مـێشكیـانی دەربـاوێن و خـۆی لێ رزگـار كـەن. بەڵام شوێنەواری ئەو بیرە چەوتانە و تەربیەتی نادروستی منداڵی‌یان، بێ‌ئەوەی بەخۆ بزانن لە ئاكار و دژكردەوە و هەڵس و كەوتیان‌دا دەمێنێ و خۆ دەنوێنێ. ئەوانـەی رەخنە لە «فـرۆید» دەگـرن و دەڵێن ناوبراو هەمـوو مـەسـەلەكـان لە روانگەی جـینسی‌یەوە دەبینێ، زۆرتر هەر ئەوانەن كـە هەمـیـشـە داسـتـان و نوكـتـەی بێ‌تامـیـان لە بارەی پێوەندی‌یە جینسی‌یەكانەوە، لەسەر زار و زمانە. ئەوان لە كـاتـی چاوخشـاندن بە رۆژنامەكان‌دا تەنیا ئەو هەواڵ و راپۆرتانە دەخوێننەوە كە پێوەندی‌یان بە تەلاق و جینایەتە جینسی‌یەكانەوە هەیە و لە ماڵێ و لە شوێنی كار دەیان كەن بە هەوێنی شۆخی و جەفەنگ.

ئەو چێژ و تامەی ئێمە لەو جۆرە شۆخی‌یانە وەری دەگرین پێوەندیی

راستەوخۆی بە پەروەردە کرانی نادروستی ئێمە لەبارەی مەسەلە جینسی‌یەکانەوە لە منداڵی‌دا هەیە. ئەو دەرسە ئەخلاقی‌یانەی لە وڵاتە مەسیحی‌یەکان‌دا لەو بارەیەوە فێری منداڵان دەکرێن، کێشەکەیان ئاڵۆزتر کردوە و ئەگەرچی ژن و مێردەکان وا دێنە بەرچاو کە پێوەندی‌یەکی گونجاویان لەگەڵ یەکتر هەیە بەڵام سەبارەت بە مەسەلە جینسی‌یەکان لە ناخەوە هەست بە تاوانباری دەکەن.

کاتێک لە پێوەندیی جینسیی ژن و پیاوێک‌دا گیروگرفت پێک دێ، ئەو گیروگرفتە لەوانەیە شوێن لەسەر ژیانی ژن و مێردایەتییشیان دابنێ و زیانی پێ بگەیەنێ. ئەگەر ژن و مێرد بە هەستی بە تاوان زانینی مەسەلە جینسی‌یەکانەوە پەروەردە بووبن، لە ژیانی ژن و مێردایەتی‌دا زوو لێک وەڕەز دەبن و ئەو گەرم و گوڕی و خۆشەویستی‌یەیان نابێ کە بۆ پەروەردە کردنی منداڵانیان پێویستە.

کاتێک منداڵان لەسەر چۆنیەتیی پەیدا بوونی ساوایەک دەکەونە وردە پرسیار، دەبێ وەڵامی روون و ئاشکرایان پێ بدەینەوە. هێندێک دایک لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا بە منداڵانیان دەڵێن: لە لای دوکتورەوە هێناومانە. ئەو جۆرە منداڵانە بەو هۆیە کە لە قوتابخانە لە رێگای دۆستانیانەوە شارەزای هێندێک لە مەسەلەکان دەبن دەست بەجێ هەست دەکەن کە نایانەوێ لە بارەی ئەو مەسەلەوە روونیان کەنەوە و دایک درۆیان لەگەڵ دەکا. منداڵێکی ئاوا بۆ دامرکاندنی هەستی کون پشکنین (کنجکاوی)ی خۆی دەکەوێتە هەوڵی وەدەست هێنانی زانیاریی زیاتر و بەو هۆیەوە کە دۆستانیشی لە توانایان دانیە زانیاریی زیاتری بخەنە بەر دەست، ئەوەندەی دیکە سەری لێ دەشێوێ. باشترین رێگا ئەوەیە کە دایک و بابەکان بۆ خۆیان منداڵانیان لەو بارەوە روون بکەنەوە. دیارە تێگەیشتنی هێندێک مەسەلە بۆ منداڵ زەحمەتە و لەو جۆرە کاتانەدا دایک و باب دەتوانن بە منداڵەکەیان بڵێن، جارێ تێگەیشتنی ئەو

مەسەلانە بۆ تۆ زووە و دەبێ راوەستی تا گەورەتر دەبی. هەر وا کە ئەگەر منداڵ لە بارەی چۆنیەتیی دروست کران و شێوەی کارکردنی ماتۆری بەرق، یان لە بارەی سیاست و مەسەلەکانی دیکەوە پرسیار بکا، پێی دەڵێین، لەو تەمەنەی تۆدا تێگەیشتنی ئەو مەسەلانە دژوارە. بەڵام نابێ بە درۆ وەڵامی بدەینەوە. چونکە زەبری وێ دەکەوێ و دەبێتە هۆی ئەوە بڕوا و متمانەی بە دایک و بابی نەمێنێ.

ئەو منداڵانەی لە بنەماڵەیەکی ئازاددا گەورە دەبن و دایک و بابەکانیان وەڵامی راست بە پرسیارەکانیان دەدەنەوە، زۆر کەم،هۆش و بیری خۆیان بە مەسەلە جینسی‌یەکانەوە خەریک دەکەن. ئەو جۆرە منداڵانە لە پاشە رۆژیش‌دا دەبن بە ئینسانێکی هاوکێش (متعادل)و، لە بواری جینسی‌دا تووشی لاڕێیی نابن.

دەستپەڕ

بەشێکی زۆر لە منداڵان بۆ ئەنجام دانی دەستپەڕ بێ مەیل نین. زۆر جاران کەسانی لەوان گەورەتر پێیان دەڵێن ئەم کردەوەیە دەبێتە هۆی نەخۆش کەوتن و کوێری و ... . ئەو قسە ناراستانە کارێکی وا دەکەن کە سەرنجی منداڵ زیاتر بۆ لای ئەو مەسەلەیە راکێشرێ. ئەگەر دایک و باب عەقلی ئەوەیان هەبێ کاتێک کە منداڵە چکۆلەکەیان دەست لە ئەندامە جینسی‌یەکانی وەردەدا، زۆر بە گرنگی نەگرن و لە منداڵەکەیانی نەکەن بە مەسەلە، منداڵەکەیان کەم وا هەیە بۆ لای دەستپەڕ بکێشرێ. چونکە هەر لە جێ‌دا مەنع کردن، دەبێتە هۆی زیاتر راکێشرانی سەرنج.

شەهوەتی جینسیی منداڵێکی ساوا لە یەکەم ساڵەکانی تەمەنی‌دا لە دەوروبەری زاری‌دا زیاتر کۆ دەبێتەوە تا لە ئەندامە جینسی‌یەکانی‌دا. ئەگەر دایک هێندێک چالاکیی زاریش هەر وەک تێکۆشانی جینسی لە منداڵەکەی مەنع بکا، ئەوکات مژتنی قامکی دەست و مەمکە مژەش

مانايەكى ديكە پەيدا دەكەن.

دەستپەڕ دامركێنەری مەیلێكە كە لە لەش داهەیە. بەڵام منداڵێك كە لەو كردەوەیە ترسێندراوە و وا تێگەیەندراوە كە ئەنجام دانی دەستپەڕ تاوانە، بەدوای ئەنجام دانی ئەو كارەدا هەست بە نارەحەتی و تاوانباری دەكا. بە تاقیكردنەوە بۆم دەركەوتوە كە ئەگەر هەستی خۆ بە تاوانبار زانین لەو پێوەندی‌یەدا نەمێنێ، منداڵ كەمتر بۆ لای دەستپەڕ دەكێشرێ.

وا دێتە بەرچاو كە هێندێک لە دایک و بابەكان پێیان خۆشە منداڵانیان دزێوترین كردەوەكان ئەنجام بدەن بەڵام فێری دەستپەڕ نەبن. بە بڕوای من سەركۆنە و سەركوتی منداڵ سەبارەت بە ئەنجامدانی دەستپەڕ، هەوێن و سەرچاوەی ئەو لاساری و تاوانانەیە كە دواتر لە لاوان ڕوو دەدەن.

یەكێک لە قوتابیانی قوتابخانەكەمان تووشی جۆرێک شێتی ببوو كە بریتی بوو لە ئاور كردنەوە و ئاگر تێبەردان. ئەو قوتابی‌یە هەم لە ماڵێ و هەم لە قوتابخانە لەسەر ئەنجامدانی دەستپەر تەمبێ كرابوو و ئەوەندەیان دەرسی ئەخلاق پێ گوتبوو و لە ئاوری جەهەننەمیان ترساندبوو، تێک چووبوو. پاش چەند ڕۆژ مانەوە لە قوتابخانە، ڕۆژێک كەمێک بێنزین و ڕەنگی تێكەڵی یەک كردبوو، كردبوویە نێو شووشەیەک و ئاوری دابوو. بە هەزار زەحمەت توانیمان ئاورەكە وەكوژێنین و پێشی سووتانی قوتابخانە بگرین. كوڕەكەم هێنایە دەفتەری قوتابخانە و لێم پرسی: دەزانی ئاگر چیە؟ گوتی: شتێكی سووتێنەرە.

لێم پرسی: تو لە كاتی هەڵایساندنی ئاگرەكەدا بیرت لە چ جۆرە ئاگرێک دەكردەوە؟

گوتی: بیرم لە ئاوری جەهەننەم دەكردەوە.

لێم پرسی: شووشە (بطری) چیە؟

لە وەڵامدا گوتی: شتێكی درێژە كە كونێكی لەوسەری دایە.

گوتم: پێم بڵێ بزانم «بطری» چ شتێکت دەخاتەوە بیر؟
زمانی تێک ئاڵا و گوتی: «شتەکەم» دەخاتەوە یاد.
گوتم: قەت وا هەیە خۆت بە «شتەکەت»ەوە سەرگەرم کەی و دەستی تێوەردەی؟

گوتی: ئێستا نا، بەڵام جاران بەدەست خۆم دادەمرکاند. کاتێک لە بارەی هۆی واز هێنان لە دەستپەڕ لێم پرسی گوتی: «بۆیە وازم لێ هێنا چونکە ئاغــای X (بەڕێوەبەری قوتابخانەی پێشوو) پێی گوتم ئەوە تاوانێکی گەورەیە دەی کەی.» من گەیشتمە ئەو ئاکامە کە شێتیی ئاگر تێبەردان (جنون آتش سوزی) لەو قـوتابی‌یەدا جێگای پەنا بردن بۆ دەستپەڕی گرتۆتەوە. بۆم روون کردەوە کە قسەی ئاغای X راست نیـە و «شتەکەی» شتێکە وەک گوێ و لووت، نە لەوان باشترە و نە خراپتر. لەو کات بەدواوە ئەو قوتابی‌یە ئۆگریی بە ئاگرەوە نەما.

منداڵ ئەگەر لە سەرەتادا، لەسەر پەنابردن بۆ دەستپەڕ، گیروگرفتی بۆ نەیەتە پێش، قۆناغی خۆ دامرکاندن بە دەستپەڕ، رەوتی سروشتیی خۆی دەپێوێ. زۆربەی ئەو زەماوەندانەی سەرکەوتوو نین و سەرناگرن، هۆیەکەیان ئەو بێزاری‌یە شاراوانەن کە ژن و مێردەکان لە پێوەندی لەگەڵ مەسەلە جینسی‌یەکاندا هەیانە. ئەو بێزاری‌یە لەو رقە خۆ مەلاس داوەوە هەڵ دەقوڵێ کە لە تەمەنی منداڵیدا -لە ئاکامی مەنع کردنی ناشیانەی دەستپەڕ لە منداڵ لە مرۆڤدا پێک دێ.

مـەسـەلەی دەسـتـپـەڕ شـوێنێکی گـرنگی لە پەروەردە بوونی منداڵدا هەیە. ئەو دیاردەیە ئەگەر بە شێوەیەکی دروست هەڵس و کەوتی لەگەڵ نەکرێ، زۆر ئاکامی نالەباری بەدواوە دەبێ. منداڵان ئەگەر سەبارەت بە ئەنجامدانی دەستپەڕ هەست بە تاوانباری نەکەن، کەمتر بۆ لای ئەو دیاردەیە رادەکێشرێن. هەتا لە ئاکام و شوێنەواری ئەو کردەوەیە زیاتر بیان ترسێنین، سەرنجی ئەوانمان زۆرتر بۆلای مەسەلەکە راکێشاوە.

[illegible] دەری خستووە کە هەستی جینسی هەر لە یەکەم ڕۆژانی ژیانییەوە لە ساوادا هەیە و ساوا بە هۆی مژینی مەمکی دایک یان مەمکەمژەوە، لە باری جینسی‌یەوە چێژ و تامی پێ دەگا. چونکە لەو تەمەنەدا ئەو هەستی جینسی‌یە کە لە دەوروبەری زار دا هەیە، لە جیاتی هەستی جینسیی ئەندامە جینسی‌یەکانی دیکەی لەش خۆی دەنوێنێ. لە روانگەی منداڵەوە دەست وەردان لە ئەندامی جینسی و کایە پێ کردنی، مانای دۆزینەوەی سروشتیی شوێن و بەشە جینسی‌یەکانی لەشی هەیە. ئەوەش مەسەلەیەکە کە تا پێش ئەو کاتە بەلای منداڵەوە زۆر گرنگ نیە. بەڵام ئەگەر دایک و باب، یان کەسانی دیکە خۆ لە مەسەلەکە هەڵقورتێنن و بە شێوەیەکی ناشیانە ئەو کارە لە منداڵ مەنع بکەن، گیروگرفت و نارەحەتی بۆ داهاتوو دەخوڵقێنن. هەتا دایک و باب لەو بارەیەوە توند و تیژتربن، ئازاری ویژدان و هەستی خۆبە تاوانبار زانین لە منداڵدا قووڵتر دەبێتەوە و تا هەستی خۆ بە تاوانبار زانین قووڵتر بێتەوە، منداڵ زیاتر بۆ لای ئەنجامدانی ئەو شتەی بە تاوان دەزانرێ، رادەکێشرێ.

منداڵ بەرلەوەی رەوانەی قوتابخانە بکرێ، دەبێ لە پێوەندی لەگەڵ دەستپەڕدا جۆرێک پەروەردە بکرێ کە هەست بە نارەحەتی و تاوانباری نەکا. هیچ کام لە قوتابیانی قوتابخانەی ئێمە سەبارەت بەو دیاردەیە ئۆگری‌یەکی تایبەتی‌یان نیە و پێیان وانیە مەسەلەی «جنسیت» شتێکی سەیر و سەمەرە و سەرنج ڕاکێشە. هەر لەسەرەتای هاتن بۆ قوتابخانە، ئێمە چۆنیەتیی دروست بوون و لەدایک بوونی منداڵانیان بۆ روون دەکەینەوە. منداڵان بە چکۆلەیی بێ ئەوەی تووشی هیچ جۆرە هەیەجانێک بن گوێ بۆ زانیاری لە بارەی چۆنیەتیی دروست بوونی منداڵەوە رادەگرن و ئێمەش دوور لە هەیەجان و زۆر ئاسایی لەو بارەیەوە بۆیان دەدوێین. بەم جۆرە کاتێک منداڵان دەگەنە تەمەنی شازدە، حەڤدەساڵی بێ ئەوەی شەرم بیان گرێ و هەست بە نارەحەتی بکەن و بێ ئەوەی هەستی جینسی

بەسەریان‌دا زاڵ بێ، لەبارەی مەسەلە جینسی‌یەکانەوە پێکەوە قسە دەکەن.

زۆر لە دایک و بابەکان کە باس دەگاتە سەر ئەو جۆرە مەسەلانە، هەمیشە بە شێوەیەکی توند و وشک لەگەڵ منداڵانیان دەدوێن. ئەو قسانەی دایک سەبارەت بە «جنسیت» لەگەڵ منداڵی دەکا، منداڵەکەی وەک شتێکی پیرۆز وەریان دەگرێ و بێ ئەملاو ئەولا قبوولیان دەکا. دایکی یەکێک لە قوتابیانی قوتابخانەکەمان بە منداڵەکەی گوتبوو، ئەگەر پەنا بەریتە بەر دەستپەڕ دەبیتە ئینسانێکی گێل و خەرفاو. ئەو قوتابی‌یە بڕوای بە قسەی دایکی هێنابوو و خۆی بە کەسێکی گێل و خەرفاو دەزانی. هەر بۆیە نەی‌دەتوانی دەرسەکانی فێربێ. بۆ ئەوەی ئەو قوتابی‌یە لەو وەزعە بێتە دەرێ ناچار بووین دایکەکەی رازی بکەین کە بە کوڕەکەی بڵێ، قسەکانی راست نەبوون. بەدوای ئەم کارەدا وەزعی ئەو قوتابی‌یە بە تەواوی گۆڕا و ئامادەیی پێویستی بۆ فێربوون تێدا پێک هات.

دایکێکی دیکە بە کوڕەکەی گوتبوو ئەگەر پەنا بەریتە بەر دەستپەڕ، خەڵک هەموو لێی بێزار دەبن. ئەو کوڕە کاتێک پێی نایە قوتابخانەکەمان، هەمیشە کاری ئەوتۆی دەکرد کە هەموان رقی لێ هەڵگرن. دزیی دەکرد، تفی لە خەڵکی دەکرد، هەرچی هاتبایە بەردەستی دەی‌شکاند تا راستیی قسەکەی دایکی هەرچی کاریگەرتر بۆ دەر بکەوێ. نموونەیەکی دیکە ئەوە بوو کە دایکێک بە منداڵەکەی گوتبوو ئەگەر لە رێگای دەستپەڕەوە خۆی دامرکێنێ، شێت دەبێ. ئەو منداڵە هەمیشە کارێکی وای ئەنجام دەدا کە هەموو لا وابزانن بەراستی شێتە.

بێ‌ئاکام کردنەوەی ئەو قسە نادروستانەی دایک و بابەکان لە سالانی یەکەمی تەمەن‌دا بە منداڵانیانی دەڵێن کارێکی زۆر سەخت و دژوارە. ئەمن بۆخۆم لەو جۆرە کاتانەدا، هەوڵ دەدەم لە هاوکاریی دایک

و بابەکان کەلک وەرگرم و رازی‌یان بکەم کە لای منداڵەکانیان دان بە هەڵەی خۆیان دابنێن. چونکە ئەو قسەیەی منداڵ لە تەمەنی پێنج ساڵی‌دا لە دایک و بابیی بیستوە، تا ئەو رادەیە جێی باوەرە کە کەسێکی دیکە ناتوانێ بە هاسانی بی‌گۆڕێ.

هەرکات منداڵ ئازادانە و بێ‌ترس لە سزادران و تەمبێ‌کران سەبارەت بە ئەنجام دانی دەستپەڕ، پەروەردە بوو، ژیان و تێکۆشانی جۆربەجۆری ئەوەندە لەبەرچاو شیرین دەبێ کە هۆش و بیری زۆر بەکەمی بۆ لای ئەندامە جینسی‌یەکانی و ئەنجام‌دانی دەستپەڕ دەچێ. بە بڕوای من منداڵانی توورە و بە بڕ و بیانوو زۆرتر ئەوانەن کە سەبارەت بە ئەنجام‌دانی دەستپەڕ لە پاڵ خۆیان‌دا لەگەڵ ئاڵۆزیی دەروونی بەرەوروون و باشترین کار ئەوەیە هەستی خۆ بە تاوانبار زانینیان تێدا بکوژین. کاتێک هەستی شەرمەزاری ویژدان بوون و خۆ بە تاوانبار زانین لە نێو چوو، منداڵانی توورە و بەبڕ و بیانوو دەبن بە ئینسانی بە کەڵک و بەختیار.

# فەسڵی چوارەم:

## مەسەلە ئەخلاقی‌یەكان

* دەرسی ئەخلاق
* شوێنەواری بیروڕاو بۆچوونی دایک و باب لەسەر منداڵ
* ئازادیی كتێب خوێندنەوە و دیتنی فیلم

## دەرسی ئەخلاق

زۆر لە دایکان و بابان پێیان وایە ئەگەر بەردەوام بایەخە ئەخلاقی‌یەکان وەبیر منداڵانیان نەیەننەوە و چاکە و خراپەیان بۆ دەست نیشان نەکەن، کارێکی خراپیان کردوە. هەر دایک و باوکێک وا بیردەکاتەوە کە دوای پاراستنی جیسمیی منداڵ، ئاشنا کردنی ئەو بە بایەخە ئەخلاقی‌یەکان لە ئەرکە گرنگە پێویستەکانە و ئەگەر منداڵ لەو بارەیەوە ڕێنوێنی نەکرێ، دەبێتە گیانلەبەرێکی وەحشی و بێ‌خێر. ئەو شێوە بیرکردنەوەیە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە زۆربەی خەڵک پێیان وایە مرۆڤ لە بنەڕەتەوە بوونەوەرێکی خراپە و ئەگەر بە شێوەیەکی باش پەروەردە نەکرێ دەبێ بە ئینسانێکی چاوچنۆک، زۆردار و تەنانەت جینایەتکار.

زۆر لە دایک و بابەکان هاتوونە لای من و گوتوویانە: «ئەگەرچی منداڵەکەم لەسەر هەر جۆرە کارێکی خراپ و ناحەز بە توندی تەمبێ کردوە، بەڵام نازانم هۆی چیە، جار لەگەڵ جار خراپتر بووە». لەو ماوە زۆرەدا کە ئەمن لە قوتابخانەدا لەگەڵ منداڵان هەڵس و کەوتم هەبووە، بەداخەوە زۆر منداڵم دیتوون کە لە ئاکامی ترسان لە تەمبێ‌کران و چوونە جەهەننەم، لەباری دەروونی‌یەوە بە تەواوی تێک چوون.

دایک و بابەکان زۆر بە کەمی لەو زیان و زەرەرانە تێ دەگەن کە لە

ئاكامی داسەپاندنی قەدەغە و قۆرغی جۆربەجۆر و نیزامە ئەخلاقی‌یەكان بەسەر منداڵاندا (لەو كاتەدا كە منداڵ لەو قەدەغە و قورغ و شتە داسەپاوانە تێ‌ناگا و بە شێوەی داخوازانە ناتوانێ قبووڵیان بكا) وەمنداڵ دەكەون. زۆرجار خەڵات كردن و هاندانی منداڵیش سەبارەت بە ئەنجامدانی كارێك كە لە توانای دانیە و یان پێی خۆش نیە، ئاكامی پێچەوانەی دەبێ و دەبێتە هۆی ئەوە منداڵ بۆ هەتا هەتایە لەو كارە بێزار بێ.

ئەو دایك و بابانەی سكاڵایان لە منداڵانی لاسار و تەربیەت هەڵنەگر هەیە، قەت ڕێگا بە خۆیان نادەن كە دەستووە ئەخلاقی‌یەكانی خۆیان بخەنە ژێر پرسیار. ئەوان وابیر دەكەنەوە كە ئەو ڕێ و شوێنە ئەخلاقی‌یانەی بە دڵیانە، نەگۆڕن و بۆ هەتا هەتایە دەمێننەوە. كەم واهەیە بە چاوی گومانەوە لەو تەربیەت و فێركردنە بڕوانن كە دایك و بابەكان و مامۆستایان و كۆمەڵ لە مێشكی ئەواندا جێگیریان كردوون. پێ‌یان وایە داب و دەستوورەكان و ڕێ و شوێنە فەرهەنگی‌یەكانی زاڵ بەسەر كۆمەڵدا ئاڵ و گۆڕ هەڵنەگر و هەمیشەیین. دیارە گومان كردن لەو ڕێ و شوێنانە و هەڵسەنگاندن و تاوتوێ كردنیان، پێویستیی بە زانین و ناسینی فەرهەنگە جۆربەجۆرەكان هەیە كە بۆ هەمووان دەست نادا.

هەربۆیە كاتێك دایك و بابەكان توانای ئەوەیان نیە فەرهەنگی زاڵ بەسەر كۆمەڵدا بە وردی و بە شێوەیەكی دروست هەڵسەنگێنن و بی‌خەنە ژێر پرسیار، هەموو تاوان و كەم و كووری‌یەكان بەسەر منداڵان دادێنن و وابیر دەكەنەوە كە منداڵ هەر زگماك تاوانبارە. ئەمن پێم وایە منداڵ هیچ تاوانێكی نیە. هەموو ئەو منداڵانەی لە باری دەروونی‌یەوە عیلاجم كردوون، ئەو ڕاستی‌یەیان بۆ دەرخستووم كە گیروگرفتەكانیان لە تەربیەتی نادروستی ساڵانی یەكەمی ژیانیانەوە بووە. دایك و بابەكان و ڕاهێنەران لە ماوەی پەروەردە و فێركردنی منداڵان لەو ساڵانەدا كە

تەمەنیان زۆر لە خوارێیە، زۆر لە حاڵە بنەرەتییەکانی دەروونناسی پشت گوێ دەخەن.

بۆ وێنە زۆربەی نزیک بە تەواوی خەڵک وا بیردەکەنەوە کە مرۆڤ گیانلەبەرێکی خاوەن ئیرادەیە و بە هێزی ئیرادەی بە هێزەوە، هەر کارێکی پێی خۆش بێ، دەتوانێ ئەنجامی بدا. ئەوە لە حاڵێک دایە کە زانستی دەروونناسی پێچەوانەی ئەو بۆچوونە، دەسەلمێنێ. زانستی دەروونناسی نیشانی داوە کە کردەوەکانی ئینسان هەتا رادەیەکی زۆر لە ئیرادەی مرۆڤ بەدەرن و بێ ئەوەی مرۆڤ بە خۆی بزانێ رەوتی خۆیان دەبڕن. بێگومان بەشێکی زۆری خەڵک لەو باوەڕەدان کە ئینسانە جینایەتکارەکان ئەگەر پشت بە ئیرادە ببەستن و ئیرادەی بەهێزیان هەبێ، دەتوانن ببنە ئینسانێکی دیکە. لەم دواییانەدا لە لەندەن پیاوێکمان سەبارەت بە پرژاندنی مەرەکەب (جوهر) بەسەر و چاوی ژناندا لە زیندان بەستاوت. لە روانگەی کۆمەڵەوە، ئەو پیاوە گیانلەبەرێکی ناجسن و دزێو و خەڵک ئازاردەرە و ئەگەر هیممەتی کردبا و ئیرادەی نواندبا، دەبووە ئینسانێکی ئاسایی. بەڵام دەروونناسێک وا بیر ناکاتەوە و پێی وایە ئەو پیاوە، کابرایەکی داماوە کە تووشی ئاڵۆزیی دەروونیی بووە و عەقلی بە خراپیی ئەو کارە ناشکێ کە ئەنجامی دەدا. هەربۆیە لە کۆمەڵێکی پێشکەوتوودا ئەو جۆرە کەسانە لە جیاتی بردنە زیندان، دەبەنە لای دوکتورە دەروونناسەکان.

دەروونناسی نیشانی داوە کە بەشی زۆری کردەوەکانی ئێمە بێ ئەوەی بەدەست خۆمان بێ روو دەدەن. دوکتورێکی دەروونناس بە هێزی لێکۆڵینەوەی ورد و دووروودرێژ دەتوانێ هۆیەکان بدۆزێتەوە. تەنانەت دوکتورێکی دەروونناسیش ناتوانێ هێندێک جار قووڵایی ئەو سەرچاوە و ناوچانە بدۆزێتەوە کە بە دەر لە ئیرادەی مرۆڤ، جڵەوی کردەوەکانی دەگرنە دەست. هەر بۆیەشە کە ئێمە جاری وایە هێندێک کار ئەنجام

...... ده بۆ خۆشمان هۆیەکەی نازانین. یان دژکردەوەی ئەوتۆ ئەنجام ...... کە بۆخۆمان نەمان ویستوە و لە خۆمان دەپرسین ئەری بۆچی وام کرد!

ماوەیەک لەمەوبەر هەموو کتێبەکانی خۆم کە لە بارەی دەروونناسی‌یەوە بوون وەلا نا و لە کاتی بێکاری‌دا گۆزەم دروست دەکردن. ئەگەر کەسێک هۆی ئەو کارەی لێ‌پرسیبام بۆخۆشم هۆیەکەیم نەدەزانی. ئەگەر لە جیاتی گۆزە دروست کردن مەرەکەبم بەسەروچاوی ژنان‌داکردبا، دیسان هۆیەکەیم نەدەزانی. چونکە گۆزەکەری لە نێو کۆمەڵ‌دا باوی هەیە، کەس کارەکەی منی پێ خراپ نیە و لەسەر ئەو کارە نام‌خەنە زیندان، بەلام پرژاندنی مەرەکەب بەسەرو چاوی ژنان‌دا لە نێو کۆمەڵ‌دا وەک شتێکی دزێو سەیری دەکرێ و هەرکەس ئەو کارە بکا دەی‌خەنە زیندان. لە نێوان من و ئەو پیاوەی مەرەکەبی بەسەروچاوی ژنان دا دەکرد، جیاوازی‌یەک هەیە، ئەویش ئەوەیە کە من تی‌دەگەم هەربۆیە گۆزەکەری هەڵدەبژێرم بەلام ئەو کە مەرەکەب دەپرژێنێ ئەو کارە لە رووی تێگەیشتنەوە ناکا. لە ئەنجامدانی کاری گۆزەکەری‌دا جۆرێک هاوهەنگاوی لە نێوان توانای ئیرادی و نائیرادیی من‌دا هەبووە. بەلام لە کردەوەی جەوهەر پرژاندنی کابرای گۆرین‌دا، لە نێوان توانای ئیرادی و هێزی غەیرە ئیرادیی ئەودا لە جیاتی هاوهەنگاوی و تەبایی، ناتەبایی هەبووە. کردەوە کۆمەڵ لێ بێزراوەکەی ئەو، ئاکامی کێشە و بێنە و بەرەی نێوان توانای ئیرادی و هێزی غەیرە ئیرادیی ئەوە.

چەند ساڵ لەوەپێش کوڕێکی یازدەساڵەیان هێنایە قوتابخانەی ئێمە. کوڕێکی زۆر زیرەک و زیندوو و لەبەر دڵان بوو. بەلام هێندێک جار، لەو کاتانەدا کە خەریک بوو بە هێمنی و لەسەرەخۆیی کتێبی دەخوێندەوە، لە نەکاو تێک رادەبوو، بە پەلە لە ژوورەکەی دەچووەدەر، شەمچەی هەڵدەگرت و هەوای ئاگر تێبەردانی قوتابخانە لە کەللەی

دەدا. هاندەرێکی دەروونیی بەرەو ئەو کارە پاڵی پێوە دەنا و نەی‌دەتوانی بەسەر خۆی‌دا زاڵ بێ.

زۆر لە راهێنەران و مامۆستایان بە لێدان و کوتان و ئامۆژگاری ناچاریان کردبوو بە کەڵک وەرگرتن لە هێزی ئیرادەی خۆی ئەو راسان و هاندەرە دەروونی‌یەی بێنێتە ژێر کونترۆڵ. بەڵام مەیل و توانای غەیرە ئیرادیی ئەو لە ئاگرتی‌بەردانی قوتابخانەدا لە ئیرادە و توانای ئاگایانەی ئەو لە پێوەندی لەگەڵ گوێ‌ رایەڵی بۆ راهێنەران و مامۆستایان‌دا، زۆر بە هێزتر بوو. ئەو کورە ئینسانێکی خراپ نەبوو بەڵکوو نەخۆش بوو. دەبێ چ شتێک ئەوی تووشی ئەو وەزعە کردبێ؟ یان بە گشتی ئەو هۆکارانە چن کە کچان و کوڕان بەرەو ئەنجام‌دانی تاوان پاڵ پێوە دەنێن؟ لێرەدا هەوڵ دەدەین روونیان کەینەوە.

کاتێک لە ساوایەک ورد دەبینەوە دەبینین ئەویش هەروەک بێچووە پشیلەیەک یان بێچووە بەبرێک هیچ جەشنە لادانێکی دەروونیی نیە. ساوایەک کە تازە لە دایک بووە هێزەکانی پێویست بۆ ژیان واتە مەیل، ئیرادە و هەوڵێکی غەیرە ئیرادی بۆ درێژەدانی ژیانی لە وجوودی‌دا هەیە. ئەو هێز و تایبەتمەندی‌یانەن کە هانی دەدەن خواردەمەنیی بخوا، بە ناسینی لەشی و تایبەتمەندیی ئەندامە جۆربەجۆرەکانیەوە خەریک بێ و ویست و مەیلە جیاوازەکانی خۆی دامرکێنێ. رەفتار و هەڵس و کەوت و کردەوەکانی بە تەواوی لەگەڵ یەک گونجاو و یەکدیگر و سروشتین. بەڵام گەورەکان بە جۆرێکی دیکە دەروانن ئەو غەریزانە.

لە روانگەی ئەوانەوە سروشتی منداڵ دەبێ ئاڵ و گۆڕی بەسەر دابهێنرێ و مشت و ماڵ بدرێ و وەک دەڵێن فێری ژیان بکرێ. لەو وەختە دایە کە منداڵ لەگەڵ قەدەغە و قورغ و رێ و شوێنە داسەپاوەکان بەرەوروو دەبێ. بۆ وێنە پێی دەگوترێ ئەم شتە پیسە، فڵان کار خراپە، فیسارە کردەوە لووت بەرزی و لەخۆرازی بوون دەگەیەنێ و ... . لە

راستی‌دا یەکەم هێز کە لە بەرامبەر هێزی ئەسلیی توانا و هەوێنی ژیان‌دا مەیدانداری دەکا پەروەردە و فێرکردنە. دەرسی ئەخلاق لە منداڵی دەوێ گوێ نەداتە هێزی سروشت و بە دەنگێکی شەیتانیی بزانێ. لە روانگەی دەروونناسی‌یەوە ئەگەر لە منداڵێکمان بوێ خۆ ویستی و لە خۆ رازی بوون وەلا بنێ، کارێکی دروستمان نەکردوە. منداڵان هەموویان خۆ بین و خۆپەرستن و دنیا بە هی خۆیان دەزانن.منداڵێک کە سێوێکی هەیە پێی خۆشە بۆخۆی بیخوا. ئەگەر دایک داوای لێ بکا لەتێکی بدا بە براکەی، ئەو منداڵە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، رق لە براکەی هەڵدەگرێ. خۆشەویستیی هاوخوێن و هاورەگەز و ... لەو تایبەتمەندی‌یانەن کە منداڵ لە رەوتی بەرەو ژوور چوونی تەمەن‌دا و بە شێوەی سروشتی فێریان دەبێ. ئەوەش ئەو کاتە دروستە کە منداڵەکەمان لە ساڵانی یەکەمی تەمەنی‌دا بۆ دڵفرەوانی و دەسکرۆیی و بەخشندەیی نەخستبێتە ژێر فشار. ئەگەر منداڵێک بە زۆر و بە نابەدڵی ناچار بە دڵفرەوانی و بەخشندەیی کرابێ، لەوانەیە بە گەورەیی هەرگیز ئەو تایبەتمەندی‌یانەی نەبێ. چونکە دایک و باب لە رێگای سەرکوت کردنی هەستی خۆپەرستی و خۆبینی لە منداڵ‌دا، لە جیاتی کوشتن و لە نێوبردن، ئەو هەستەیان بۆ هەمیشە لە مێشکی ئەودا جێگیر کردوە.

زانستی دەروونناسی دەری خستوە و پێی سەلماندووین کە مەیل و خۆزیا دانەمرکاوەکان، بێ ئەوەی مرۆڤ خۆی پێ بزانێ، بە شێوەیەکی هەڵسوور و چالاک لە وجوودی‌دا دەمێننەوە. هەر بۆیە ئەو منداڵەی ناچار کراوە کە دڵفرەوان و بەخشندە بێ، بۆ ئەوەی دایک و بابی لێی رازی بن، ویستەکەی ئەوانی هێناوەتە دی و لە ئاکام‌دا ویست و داخوازە راستەقینەکانی واتە خۆبینی و خۆپەرستییە سروشتی‌یەکەی، لە ناخی خۆی‌دا حەشار داوە. منداڵێکی ئەوتۆ بەو هۆیە کە مەیلێکی سروشتیی تێدا سەرکوت کراوە، لە تەواوی ژیانی‌دا خۆبین و خۆپەرست دەمێنێتەوە.

بۆیە ئەو جۆرە فێرکردنە ئەخلاقی‌یانە بنچکە لە شکان ئاکامێکی دیکەیان نابێ. ئەو قسەیە لەبارەی چونیەتیی بەرەورروو بوونەوە لەگەڵ پرسیاری منداڵ لەبارەی مەسەلە جینسی‌یەکان و چۆنیەتیی دروست بوونی ساوایەکیش‌دا هەر راستە. پەنا بردن بۆ درۆ کردن و ئامۆژگاریی ئەخلاقی، منداڵ زیاتر بۆ لای مەسەلەکە رادەکێشێ و مەسەلەکە لە مێشکی‌دا هەر دەمێنێتەوە. ئەو ئینسانانەی عەکسە دزێو و دوور لە حەیا و ئەدەبەکان دەخەنە بەرچاوی قوتابیان یان ئەندامی جینسیی خۆیان بە خەڵک نیشان دەدەن و لە ئاکام‌دا تووشی گیران و زیندان دەبن، ئەوانەن کە بە منداڵی، لە دەرسە نادروستە ئەخلاقی‌یەکان بۆ تەربیەت کردنیان کەڵک وەرگیراوە. لەراستی‌دا سەرنج دان و ورد بوونەوەی سروشتی و بێ تاوانانەی منداڵ لە ئەندامەکانی لەشیان، وەک گوناحێکی گەورە پێ ناسێندوە. هەر بۆیە منداڵ ناچار بووە ئەو جۆرە هەست و حاڵەتانەی خۆی سەرکوت بکا، بەڵام بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ لە وجوودی دا هەر ماونەوە و زۆرجار بە شێوەیەکی سەمبولیک خۆ دەنوێنن. لە ئاکامی ئەو راستی‌یە دایە کە زۆرجار کەسانێک هەڵدەکەون بێ ئەوەی هیچ پێداویستی‌یەکی ماددی‌یان هەبێ لە دوکان و فروشگەکان شت هەڵدەگرن و دزی دەکەن. سەرچاوەی کردەوەی سەمبولیکی ئەو جۆرە کەسانە دەگەرێتەوە سەر سەرکوت کرانی هێندێک لە مەیل و داخوازەکانی منداڵی‌یان بە هۆی دەرس و ئامۆژگاری‌یە ئەخلاقی‌یە ناسروشتی‌یەکانەوە. ئینسان بوونەوەرێک نیە کە سروشتێکی دژ بە کۆمەڵی هەبێ. کاتێک لە نێوان «منی سروشتی» و «منی راهێنراو بە ئەخلاقیات»دا کێشە و بێنە و بەرەیەکی توند روو دەدا، خۆویستی و خۆبینیی قۆناغی منداڵی سەر لە نوێ خۆ دەنوێنێتەوە و ترس و نیگەرانی لە قەزاوەتی کەسانی دیکە، دەکەوێتە پلەی دووهەمی گرنگی. هەربۆیە حەز و مەیلە سەرکوتکراوەکانی منداڵیی کەسێک کە خولیای دزی کردنی هەیە، لە

...ەرانەی ئەو لە سزادران و تەمبێ کران لە لایەن دادگا ...انەوە، یەکجار بەهێزترە.

...نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە کە پەل و پۆ هاویشتنی ویست و مەیلە ...کانی منداڵ و رەوتی ئەو هەڵدان و پەل و پۆ هاویشتنە باشتر ...دەخا. کاتێک منداڵێکی چکۆڵەی ٧ ساڵە بە ناوی «بیلی» یان هێنایە قوتابخانەکەمان، دایک و بابەکەی پێیان گوتین کە منداڵەکەیان فێری دزی بووە. حەوتوویەک دوای پانسیون کرانی لە قوتابخانەکەمان، یەکێک لە هەڵسووڕێنەرانی قوتابخانە پێی راگەیاندم کە سەعاتە زێڕەکەی لەسەر مێزی ژووری خەوتنی خۆی داناوە و ئێستا دیار نیە. لە راهێنەری قوتابی‌یە چکۆلەکانم پرسی داخوا لەو بارەیەوە هیچ زانیاری‌یەکی هەیە؟ لە وەڵامدا گوتی: بیلی هێندێک لەت و پەتی سەعاتی پێ بوو کایەی پێ دەکرد. «بیلی»م بانگ کرد و لێم پرسی: ئەو لەت و پەتانەی سەعاتت لە کوێ دەست کەوتوە؟ گوتی لەوسەری باغی لە قوڵکەیەکدا دۆزیومنەوە. دەمزانی بیلی هەموو شتەکانی خۆی لە چەمەدانێکدا هەڵدەگرێ و دای دەخا، چەمەدانەکەم بە کلیلەکانی خۆم هەڵگرت و لەت و پەتەکانی سەعاتە زێڕەکەی کابرای هاوکارم لە وێدا دۆزینەوە. دیار بوو سەعاتەکە بە زەبری چەکوچ و مقەست لێک هەڵوەشێندرابوو. چەمەدانەکەم داخست و بانگی «بیلی»م کرد. لێم پرسی: سەعاتەکەی ئاغای ئاندرسێن پێ نازانی؟

بە چاوێکی بێ تاوانانە لێی روانیم و گوتی: «نا». پاشان گوتی «کێهە سەعات؟»

بڕێکی دیکە چاوم بڕی‌یە چاوی و لێم پرسی: تۆ دەزانی ساوا (منداڵێکی ساوا) لە کوێ را دێ؟

بە سەرنجێکی تایبەتی‌یەوە سەیری کردم گوتی: بەڵێ، لە ئاسمانەوە دێ.

بە بزەوە گوتم: نا وانیە. ساوا لە سەرەتادا لە سکی دایکی دایە و پاش ئەوەی بە قەرا پێویست گەورە بوو، لەوێ دێتە دەر.

لەگەڵ تەواوبوونی قسەکەم چوو چەمەدانەکەی کردەوە و لەت و پەتی سەعاتە شکاوەکەی بۆ هێنام. لەو وەختەرا پێویستیی دزی کردن لەودا مرد، چونکە لەراستیدا ئەو بە دوای دۆزینەوە و ناسینی واقیعییەتەوە بوو و دەیەویست پێی بگا. لەوکاتەوە نیگەرانی و نارەحەتی ئەویان بەجێ هێشت و بوو بە کوڕێکی شاد و کەیف خۆش.

ڕەنگە خوێنەران ئەو کارەیان وەک کارێکی سێحراوی بێتە بەرچاو. کەچی هیچ سێحر و جادوویەک لەو کارەدا نەبووە.

مەسەلەکە بەو جۆرە بووە: بیلی بەرلەوەی بێتە قوتابخانەی ئێمە هەمـوو جارێ کـە لە دایکی پرسیـوە ساوا لە کوێ ڕا دێ، دایکی گوتویەتی لە ئاسمانیڕا. بەڵام بەو هۆیەکە باوکی بیلی لە ماڵێ چەندین سەگی ڕاگرتوە و بیلی لە نزیکەوە تەرەکینی سەگەکان و لەدایک بوونی توولەکانی دیوە، کـەم و زۆر سـەری لە پەیدا بوون و لەدایک بوونی ساواش دەرکردوە. کەچی دایکی وەڵامی ناراستی داوەتەوە و بە ناچار لە زانیاری‌یەکانی خۆی کەوتۆتە گومان. بەڵام خولیای حەقیقەت ناسی و دۆزینەوەی ڕاستی‌یەکان وای لێ کردوە هەر دەزگا و ئامرازێک لێک هەڵوەشێنێ تا بزانێ چیان لە نێو دایە. هەر بۆیە هەڵوەشاندنی سەعاتی گۆرین هەوڵێکی سەمبولیک بووە بە مەبەستی سەردەرکردن لە چونیەتیی پەیدا بوونی ساوا. قوتابی‌یەکی دیکەشم هەبوو کە هەر ئەو گیرو گرفتەی هەبوو بۆیە بەردەوام خەریکی کردنەوە و داخستنی کەشۆی مێزەکان بوو.

بەڵام مەسەلەیەکی دیکە کە دایک و بابەکان دەبێ بایەخی پێ بدەن ئەوەیە کـە نابێ کارێکی ئەوتۆ بە منداڵان بکەن کە هێشتا ئامادەیی ئەنجامدانی ئەویان تێدا پێک نەهاتوە. ئەوانەی منداڵە چکۆڵەکانیان کە وەختی گاگۆڵکەیانە بە زۆری بەسەر پێوە ڕادەگرن و ناچاریان دەکەن بە

دوو لاق بڕۆن، دەبنە هۆی گێژ بوونی منداڵەکەیان و بە هیچ ئاکامێکی دیکە ناگەن. چونکە لاقەکانی منداڵ لە تەمەنی گاگۆڵکەدا توانای ڕاگرتنی قورسایی لەشی وی‌یان نیە و داخوازی دایک و باب بۆ ئەوەی بێ یارمەتیی دەست و تەنیا بە لاقەکانی بڕوا، داوایەکی بێ جی‌یە. ئەگەر دایک و باب ئەوەندەیان سەبر هەبێ تا منداڵەکەیان بە شێوەی سروشتی ئامادەیی تێدا پێک دێ، ئەوکات بە چاوی خۆیان دەبینن کە منداڵەکەیان بێ ئەوەی کەس داوای لێ بکا بۆ خۆی بە دوو لاقان دەڕوا. لە بوارەکانی دیکەش‌دا، داوای پێش وەختی دایک و باب لە منداڵ وەک خۆ خاوێن ڕاگرتن و میزبە خۆ دانەکردن لە نێو جێ‌و بان ... دا، ئاکامی دڵتەزێنی بەدوادا دێ.

ئەو قسانە لە پێوەندی لەگەڵ ئاشنا کردنی منداڵ بە ڕەفتار و ئەخلاقیش‌دا هەر دروستن. کاتێک منداڵێک ناچار دەکەین ئەو بایەخە ئەخلاقی‌یانە قبووڵ بکا کە هێشتا ئامادەیی پێویستی بۆ تێگەیشتن و ڕەچاو کردنیان تێدا پێک نەهاتوە، نەک هەر لە سەر ڕەوتی قبووڵ کردنی بایەخەکان لە لایەن منداڵەکەوە بووین بە کۆسپ، بەڵکوو لەباری دەروونی‌یەوەش تووشی شێوان و ئاڵۆزیمان کردوە.

ئەگەر بە منداڵێکی ٦ ساڵە بڵێین پێویستە لە فلان لقی وەرزیشی‌دا زیاتر لە توانای خۆی، خۆی بنوێنێ، ئاکامێکی باشمان دەست ناکەوێ. بەڵام ئەگەر لێی ڕاوەستین تا گەورەتر دەبێ و هێز و توانای بەرەبەرە دەچێتە سەر، نەک هەر ئۆگری ئەو وەرزیشە دەبێ، بەڵکوو لە کێ‌بەرکێ‌یەکاندا سەردەکەوێ. لەبواری هەڵدانی فەرهەنگی و ئەخلاقییش‌دا هەر بەم شێوەیە نابێ پەلە لە منداڵ بکەین. دایک و باب دەبێ بە سەبر و لەسەرەخۆ بن، بڕوایان بە منداڵەکەیان هەبێ و دڵنیابن ئەگەر هەڵدانی سروشتیی ئەو لەگەڵ هیچ کۆسپێکی لاوەکی بەرەوروو نەبێ، منداڵەکەیان لە داهاتوودا دەبێ بە ئینسانێکی کامڵ و تەواو.

ئەزمـوونی چەندین سـاڵ ژیان لەگـەڵ منداڵان ئەو راسـتی‌یەیان بۆ دەرخستووم کە فێرکردنی چۆنیەتیی ئاکار و رەفتار بە منداڵان کارێکی بەتەواوی بێ‌جی‌یە. ئەگـەر لەو بارەیەوە فـشـاریان بۆ نەیەنین، منداڵان لەکاتی خۆی‌دا دەتوانن چاکە و خراپە لێک جوێ بکەنەوە.

ئەگـەر دایک و بابەکـان بۆخـۆیان ئینسـانێکی راست و دروست و شەریف بن و لە ژیانیان‌دا رێ و شوێنە راستەقینەکانی ئەخلاق رەچاو بکەن، منداڵانیشیـان لەکـاتی خۆی‌دا وەک ئەوانیان لێ دێ. هۆیەکەشی ئەوەیە منداڵان ئەو بایەخ و رێ و شـوێنانە فـێر دەبن کـە لە مـوحیـتی ژیانیان‌دا هەیە و ئەگەر منداڵ لە موحیتێکی سالم‌دا گەورە بێ، بە بایەخ و رێ و شوێنە ئەخلاقی‌یە دروستەکانی ئەو موحیتە ڕادێ.

## شوێنەواری بیرورا و بۆچوونی دایک و باب لەسەر منداڵ

دایک و بـابەکـان و راهێنەرەکـان فـێربوون بۆچوون و بیـروراکـانی خۆیان بەرنە نێو مـێشکی منداڵ و بەسەری‌دا بسـەپێنن. چونکە پێ‌یان وایە لەسەر ئەو مـەسـەلانە کە منداڵ دەبێ فـێریان بێ و هەروەها لە بارەی زەوق و عـەلاقەی ئەو لە داهاتوودا، زانیاریی تەواویان هەیە. پێم‌وایە ئەو جۆرە بیـرکردنەوەیە، چەوت و ناراستـە. ئەمن بۆخـۆم قـەت هەوڵ نادەم منداڵان بێنە سـەر بیـرورای من یان وەک من بیـربکەنەوە. قـەتیش بە ئاگـایی‌یەوە نەم‌ویسـتـوە منداڵان بخـەمـە ژێر شـوێنەواری بیـروباوەڕێکی تایبـەتی (وەک بیـرورای ئاشتـیـخـوازانە، بیـرورای ئەوانەی لایەنگری گیاخۆرین، بیرورای ریفورمیستی و ...). چونکە دەزانم «موعظە» کردن بۆ منداڵان خێر دانەوەیەکی نابێ. ئەوەی من ئیـمانم پێ‌یـەتی و پێم وایە دەتوانێ لاوان دژی بیـروباوەڕی کۆنەپەرستـانە و فـاشیـزم و هەر شێوە بیرکردنەوەیەکی چەوت پێ بکەیەنێ، ئازادی و ژیانی سەربەستانەیە.

هەر بیـروباوەڕێک بە زۆر بەسـەر منداڵ‌دا سـەپێندرابێ، زەبر لە

شەخسییەتی ئەو دەدا. منداڵ منداڵە، نەک گەورەیەکی چکۆلە و نابێ وەک ئینسانێکی گەورە سەیری بکرێ و ناتوانێ وەک گەورەکان بیر بکاتەوە و مەسەلەکان وەک ئەوان ببینێ. منداڵ شێوە بیرکردنەوە و روانین و مەنتیقی تایبەت بە خۆی هەیە و دەبێ رێگا بدەین مەنتیق و شێوە روانینی خۆی پەروەردە بکا.

با لەو پێوەندی‌یەدا نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە: شەوێک بە ٥ کەس لە قوتابیانی تەمەن ٥ تا ٧ساڵم گوت لەبەر ئەوەی یەکێک لە هاوڕێ‌یەکانیان سەرمای بووە و حاڵی باش نیە، زووتر لە شەوانی دیکە چوونە ژووری خەوتن تا بحەسێتەوە. ئێوەش کە چوونە ژووری خەوتن، دەنگە دەنگ مەکەن تا خەو و حەسانەوەی هاوڕێ‌یەکەتان نەشێوێنن. بەڵێنیان دامێ کە لە قسەم دەرنەچن و بە تەواوی بێدەنگی بپارێزن. پێنج دەقیقە دوای ئەو بەڵێن‌دانە چووبوونە ژووری خەوتن و دەستیان کردبوو بە قاوە قاو و بەمەلافە و باڵنج یەکتریان داگرتبوو. ئەگەر ئەو فەرزە کە ئەوان لە خۆوە ویستوویانە هاوڕێ نەخۆشەکەیان ئازار بدەن وەلا بنێین، پێم وایە هۆی ئەو کارەیان دەگەڕێتەوە سەر سروشتی منداڵان لەو تەمەنەدا. دڵنیام ئەگەر لەو وەختی‌دا یەکێک بە تووڕەیی‌یەوە تێی‌راخوڕیبان و هەڕەشەی لێ کردبان، بێدەنگی‌یان دەپاراست، بەڵام ئەو بێ‌دەنگی‌یە لە ئاکامی ترساندنی ئەو منداڵانەدا پێک دەهات. روانینی گشتی لە بارەی پەروەردە کردنی منداڵانەوە ئەوەیە کە دەبێ منداڵان جۆرێک فێر بکرێن کە لەگەڵ مەبەست و چاوەڕوانی‌یەکانی گەورەکان بێنەوە، واتە بەو جۆرە بژین کە گەورەکان پێ‌یان باشە یان ئەو کارانە کە گەورەکان پێ‌یان چاک نین، ئەنجام نەدەن. کە دیارە ئەوە بۆچوونێکی باش نیە.

دایک و بابەکان دەبێ بزانن کە منداڵ سەری لە پێوەندیی نێوان هۆ (علت) و «معلول» دەرناچێ. کاتێک پێی دەگوترێ لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ

کارێکی خەتات کردوە سەری حەوتوو خەرجی گیرفانت نادرێتێ، ئەو تێناگا ئەم دووانە چ پێوەندی‌یەکیان بە یەکەوە هەیە. هەربۆیە ئەوە کارێکی دروست نیە. چونکە لە دوایین رۆژی حەوتوودا کە خەتا و لادانەکەیان بە چاوی دادایەوە، بەراستی پێی تێک دەچێ و بە خۆدا دەشکێتەوە. لە روانگەی ئەوەوە کارێکی نادروستی رۆژی یەکەمی حەوتوو هیچ پێوەندی‌یەکی بەو دراوەوە نیە کە سەری حەوتوو بۆ خەرجی دەی‌درێتێ.

حەق ئەوەیە دایک و بابەکان هەمیشە لە خۆیان بپرسن داخوا لەبەر خۆ بەزل زانی و دەسەلاتخوازی نیە کە پێیان خۆشە منداڵانیان، داوا و ئەمرەکانیان بێ‌ئەملاو و ئەولا جێ‌بەجێ بکەن؟ هەموو کەسێک پێی خۆشە بکەوێتە بەر دڵی خەڵکی و خەڵک لێی رازی بن. ئەو پێخۆش بوونە لە منداڵانیش‌دا لە قۆناغێکی تایبەتی‌دا خۆ دەنوێنێ. لەو قۆناغە دایە کە منداڵان ئاگایان لە ئاکار و هەڵس و کەوتی خۆیان دەبێ و کەمتر بە لای کاری بێ جێ‌وە دەچن. دایک و بابەکان نابێ لە گەیشتنی منداڵ بەو قۆناغە، بەپەلە بن. چونکە پەلە کردن لە منداڵ لەو پێوەندی‌یەدا منداڵ تووشی زۆر زیانی قەرەبوو نەکراو دەکا. منداڵان دەبێ ماوە و دەرەتانی تەواویان هەبێ بۆ ئەوەی بە شێوەی سروشتی پێ بنێنە ئەو قۆناغە.

ترساندنی منداڵان و مێرمنداڵان لە ئاوری جەهەننەم و سزاکانی دنیای دیکەش، ئاکامی زۆر تاڵی بەدواوە دەبێ. ئەم ترساندنە گەلێک پرسیار لە بارەی مەسەلە جینسی‌یەکان و مەسەلە جۆربەجۆرەکانی دیکە لە مێشکی منداڵاندا دروست دەکا. ئاکامی ترساندنی منداڵان لە سزای دنیای دیکە، ئەوە دەبێ کە بە گیانی هەست کردن بە تاوانباری گەورە دەبن. هەست کردن بە تاوانباریش، لە خۆ بێزار بوونی لەگەڵ دایە. جا دیارە ئەوکەسەی لە خۆی بێزارە، ناتوانێ خەمی کەسانی دیکەی لەبەر بێ.

## ئازادیی کتێب خوێندنەوە و دیتنی فیلم

چەندە و تاکوێ دەتوانین منداڵان لە خوێندنەوەی هە جۆرە کتێب و بابەتێکدا ئازاد بکەین؟ ئەوە پرسیارێکە زۆر لە دایکان و بابەکان لە خۆیانی دەکەن. لە کتێبخانەی قوتابخانەی ئێمەدا لە هەموو بوارەکاندا بۆ وێنە دەروونناسی، چیرۆک، گیروگرفت و مەسەلەکانی لاوان و ... کتێب هەیە. بەڵام بە تاقیکردنەوە بۆم دەرکەوتوە کە منداڵان زۆر بە کەمی ئەو کتێبانە دەخوێننەوە کە ئێمە پێمان وایە زیانیان پێ دەگەیەنن. وا دێتە بەرچاو کە زەینی منداڵان لە زەینی گەورەکان زۆر خاوێنترە. منداڵێک لەوانەیە کتێبێک بخوێنێتەوە و هەر لە جێدا گرنگی نەدا بە بەشە بێتام و دزێوەکانی. ئەگەر ئێمە وەڵامی دروست بە پرسیارەکانی ئەو لە بارەی مەسەلە جینسی‌یەکانە بدەینەوە، مەترسیی راکێشرانی ئەو بۆ لای خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی تووشی لاڕێیی دەکەن، بنەبڕ دەکەین. لەو پێوەندی‌یەدا سانسۆر کردنی کتێب بە کارێکی هەڵە دەزانم و لەو باوەڕەدام کە لە جیاتی سانسۆر، باشترە منداڵەکانمان لە مەسەلە جۆربەجۆرەکان ئاگادار بکەینەوە.

لە بوارەکانی دیکەدا، بۆ وێنە سەبارەت بە کتێبە ترسێنەرەکان، مەسەلەکە ئاڵۆزتر دەبێتەوە. منداڵێک کە نەخۆشیی ڕەوانیی هەیە، دروست نیە کتێبێکی بە سام و ترسی وەک کتێبی دراکولا بخوێنێتەوە. بەو حاڵەش لەبەر ئەوەی من وەک دەروونناسێک دەبێ هۆیەکانی ترسان دەست نیشان بکەم، لەو جۆرە کاتانەشدا، دژی خوێندنەوەی ئەو جۆرە کتێبانە ناوەستم و پێم خۆشە هۆیەکانی ئەو ترسانەم بۆ روون ببنەوە کە لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو کتێبە بەسام و ترسێنەرانەدا خۆیان دەردەخەن.

ژمارەیەکی زۆر لە منداڵان بە تایبەتی ئەوانە کە بنەماڵەکانیان بیروباوەری خورافی‌یان هەبووە، لە رەشایی (اشباح) و بوونەوەری خەیاڵی دەترسێن. بە بڕوای من لەو بارەوەش هەروا کە لە پێوەندی لەگەڵ

گیروگرفت و مسەلە جینسی‌یەکان‌دا گوتم: باشترین ڕێگا لە نێو بردنی ترس و شکاندنی سامە نەک پێشگیریی خوێندنەوەی کتێب.

دەزانم کاتێک ڕەشایی یان بوونەوەری خەیاڵی دەچنە مێشکی منداڵەوە، هێنانە دەری ئەو بوونەوەرانە لە مێشکی کارێکی بە تەواوی دژوارە. بەڵام ئەرکی هەر دەروونناس و ڕاهێنەرێک ئەوەیە کە مێشکی منداڵ لەم جۆرە بیرانە پاک بکاتەوە. لەسەر دایک و باوکانیش پێویستە هەر لە جێ‌دا نەهێڵن ئەو فکرە بێ بناغەیە بچنە مێشکی منداڵەوە. هەر بۆیە واباشە قەت ئەو چیرۆک و بەسەرهاتانەیان بۆ نەگێڕنەوە کە دەبنە هۆی ترسانیان.

سەبارەت بە تەلەویزیون و سینەما دەبێ بڵێم کە فیلم و کتێب دوو شتی لێک جیاوازن. ئەو شتەی نووسراوە، ناتوانێ بە قەت ئەو شتەی بە گوێ دەبیسرێ یان بە چاو دەبینرێ، شوێن دابنێ. ئەم ڕۆژانە لە زۆربەی فیلمە سینەمایی‌یەکان‌دا ترس و توند و تیژی بە ڕادەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێ. هێندێک لەو فیلمانە منداڵان بە ڕاستی زراوبردوو دەکەن. جا بۆیە ئەو منداڵانەی لە باری ڕەوانی‌یەوە نەخۆشن ، یان ئەوانە کە خێرا دەکەونە ژێر تەئسیر و بۆ دنەدران ئامادەیی زۆریان هەیە، نابێ ئەو جۆرە فیلمانەیان نیشان بدرێ. بەڵام سەبارەت بە فیلمەکانی دیکە کە گیروگرفتە کۆمەڵایەتی‌یەکان، مەسەلەکانی پێوەندی‌دار بە بنەماڵە، یان ڕووداوە مێژوویی‌یەکان باس دەکەن، دایک و باوکان نابێ ئەو دوو دڵی‌یەیان هەبێ کە لەوانەیە دیتنی ئەو جۆرە فیلمانەش بۆ منداڵانیان خراپ بێ. چونکە ئۆگری و تێگەیشتنی منداڵان لەگەڵ دەرک و بۆچوونی گەورەکان جیاوازیی زۆری هەیە و ڕەنگە ئەو بەش و دیمەنەی گەورەکان بە ناخەز و بێ تام و خراپی دەزانن، کەم تا زۆر سەرنجی منداڵان ڕانەکێشن.

## فەسڵى پێنجەم:

# گیرو گرفتەكانى منداڵان

* خەڵك ئازار دان و خوو و خدەى درندانە
* بەد ئاكارى
* دزى
* دەروونناسى و چارەسەرى منداڵ.

## خەڵک ئازار دان و خوو و خدەی دڕندانە

هەر لە جێدا منداڵان غەریزەیەک بە ناوی خەڵک ئازار دان و خوو و خدەی دڕندانەیان تێدانیە. زۆر جار بە نا ئاگایی و لە خۆوەیە کە منداڵ تووشی خەڵک ئازاردان دەبێ.بە درێژایی ئەو چەندین ساڵە کە ئەرکی بەرپرسایەتیی منداڵانم لەسەر شان بووە زۆر کەم دیومە منداڵێک سەری لە ئەشکەنجە کردن و ئازاردانی گیانلەبەران بخوری. نموونەیەک کە لە بیرمە هی چەندین ساڵ لەمەوبەرە. مەسەلەکە بەو جۆرە بوو کە دایک و بابی کوڕێکی سێزدە ساڵە کە ناوی «ژان» بوو، بە بۆنەی ساڵرۆژی لەدایک بوونی کۆرەکەیانەوە، سەگێکیان بە دیاری پێ دابوو. دایکی لە نامەیەک دا بۆی نووسیبووم لەبەر ئەوەی «ژان» زۆر کەیفی بە گیانلەبەران دێ، ئەو سەگەمان بە دیاری بۆ ناردوە. «ژان» زۆر باش بە سەگەکەی رادەگەیشت بەلام رۆژێک بۆمان دەرکەوت کە دوور لە چاوی ئێمە سەگەکەی ئازار دەدا. من هاتمە سەر ئەو باوەڕە کە سەگەکەی لە جێی برا چکۆڵەکەی «جیم» داناوە و چونکە پێی وایە دایکی، جیمی لەو خۆشتر دەوێ، داخی دڵی خۆی بەو سەگە دەڕێژێ و لەراستیدا پێی وایە بە ئازار دانی سەگەکە، جیمی ئازار داوە. رۆژێک لەو کاتەدا کە لە سەگەکەی دەدا چوومە لای و لە کاتێکدا بە ناوی «جیم» سەگەکەم بانگ دەکرد دەستم کرد بە لاواندنەوەی. مەبەستم لەو کارە ئەوە بوو ژان لەو رق و بێزاریە ئاگا بکەمەوە کە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ لە دژی

جیم تێی‌دا کۆ ببۆوە. ژان لەو کات بەدواوە سەگەکەی ئەزیەت نەدەکرد، چونکە لەو رق و بێزاری‌یە کە لەبەر ئێرەیی بردن بە براکەی تێی‌دا پێک هاتبوو، ئاگا ببۆوە و توانیبووی بەسەری‌دا زاڵ بێ.

ئەو منداڵانەی رازی و ئازادن، هۆیەک بۆ ئازاردانی خەڵک شک نابەن. زۆر لە منداڵان لە ئاکامی بەد رەفتاریی گەورەکانیان لەگەڵ ئەوان‌دا، تووشی توندو تیژی و خەڵک ئازاردان دەبن. کەسێک کە لێی دەدرێ پێی خۆشە وەک تۆڵە کردنەوە لە کەسێکی دیکە بدا. منداڵانیش وەک گەورەکان و مامۆستاکان کە لە منداڵان و قوتابیانی لە خۆیان بەرەوژێرتر دەدەن، دوای ئەوەی لێدانیان وێ‌کەوت، بە دوای یەکێکی لە خۆیان لاوازتر و بێ‌دەسەڵاتتردا دەگەڕێن تا تۆڵەی خۆیان لەو بستێننەوە و داخی دڵیان بەو بڕێژن. ئەو قوتابیانەی لە قوتابخانەکەیان‌دا رەفتاری توند و تیژیان لەگەڵ دەکرێ بە شێوەیەکی توند و تیژ لەگەڵ یەکتر هەڵس و کەوت دەکەن. لەو قوتابخانانەش‌دا کە منداڵان ئازادن و لێدان و تەمبێی جیسمی لە گۆڕێ‌دانیە، قوتابیان بە نەرمی و لەسەرەخۆیی لەگەڵ یەک دەجووڵێنەوە و زۆر بە کەمی توند و تیژی بەرچاو دەکەوێ.

دایک و بابەکان بۆ تەمبێ کردنی منداڵانیان بیانووی جۆربەجۆر دێننەوە. ئەوان دەڵێن: بۆیە منداڵمان تەمبێ دەکەین تا ئامادەیی پێویستیان بۆ بەرەو روو بوونەوە لەگەڵ دنیای پڕ مەترسیی داهاتوودا تێدا پێک بێنین. یان دەڵێن: بۆیە کوڕەکەم تەمبێ دەکەم چونکە بابیشم بە منداڵی منی تەمبێ دەکرد و تەمبێ کرانەکەی ئەو کات بۆ ئێستام بە قازانج بووە. ئەو جۆرە داکۆکی کردنانە زۆر ساویلکانە و نامەنتیقین. ئەگەر دایک و بابەکان چ بڕ سەداقەتیان بوایە رەنگە گوتبایان فشاری گیروگرفتەکانی ژیان یان نەحاوانەوە لەگەڵ هاوسەر، یان تووشی ناکۆکی بوون لەگەڵ دۆستان، یان بۆ وێنە ماندوو بوون لە کارەکەمان و تووڕە و تۆسن بوونی سەرۆکی ئیدارەکەمان وای لێ کردووین هەموو داخی دڵی

خۆمان بە منداڵەکانمان کە ناتوانن لە بەرامبەرمان‌دا دەست بکەنەوە و تۆڵەمان لێ بستێننەوە، بڕێژین. ئەگەر بتوانین هۆ و هاندەرەکانی تەمبێ کردنی منداڵان تێ بگەین، ڕەنگە پێویستیمان بە تەمبێ کردنی ئەوان نەبێ!

کەوابوو شەڕانی بوون، خەڵک ئازار دان و خوو و خدەی دڕندانەی زۆر لە منداڵان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەفتارە هەڵە و نادروستەی کە دایک و بابەکان ، مامۆستایان و کەسانی دیکە بەرامبەر بەوان هەیانە. ئەگەر هەوڵ بدەین ئەو ڕەفتارە بە باری باش‌دا بگۆڕین، منداڵ ئیدی تۆڵە کرێتەوە و هەڵس و کەوتی گونجاو لەگەڵ ئەو چەشنە ڕەفتارە بە پێویست نازانێ و واز لە شەڕانی بوون و توندو تیژی نواندن و ئازاردانی خەڵک دێنێ.

## بەدئاکاری

زۆر لە دەروونناسان لەسەر ئەو باوەڕەن کە منداڵ لەکاتی لەدایک بوون دا نازانێ چاکە و خەراپە چیە. بەڵام بە هەردوو باردا مەیلی هەیە. من بۆخۆم لەسەر ئەو باوەڕەم کە هیچ چەشنە غەریزەیەکی تاوانخوازی، یان مەیلێکی سروشتی بەلای بەدزاتی‌دا لە منداڵ‌دا نیە. بەدئاکاریی منداڵان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سۆز و هەستە لاڕێ کراوە کە لە ئاکامی نەبوونی خۆشەویستی و تەبایی لە بنەماڵەو دەور و بەردا لە منداڵ دا پێک دێ.

ڕۆژێک یەکێک لە قوتابیانی قوتابخانەکەمان کە تەمەنی ٩ ساڵ بوو، خەریکی دروست کردنی بەلەمێکی گچکە بوو و لەبەر خۆشیەوە گۆرانیی دەگوت. نێوەڕۆکی گۆرانی‌یەکەی ئەوە بوو: «خۆزگە دایکم مردبا» ئەو وشانە بە ناناگایی لە قووڵایی دڵیەوە هەڵ‌دەقوڵێن. چونکە هەموو بیر و هۆشی بە دروست کردنی بەلەمەکەوە خەریک بوو

و بیرو هۆشی ئەوەندە ئازاد نەبوون کە بە ئاگایی‌یەوە، ئەو رستەیە دروست بکا. راستی‌یەکەی ئەوە بوو کە دایکی، خۆشی نەدەویست و بە دەگمەن دەهاتە سەردانی. ئەو کوڕە بە شێوەیەکی لە خۆوە لەو راستی‌یە تێگەیشتبوو و پێیەوە نارەحەت بوو.

قسەی تێدانیە ئەو کوڕە . کە زۆریش خوێن شیرین و ڕەزا سووک بوو . بە گوتنی ئەو گۆرانی‌یە تاوانێکی نەکردوە و ڕەوا نیە پێی بگوترێ بەدئاکار و جینایەتکار. ئەو، هەر لەو شێوە هەمیشەیی‌یە کەڵکی وەرگرتوە کە منداڵان بە نیازی راکێشانی سەرنج و خۆشەویستیی دایک و بابیان لە دڵی خۆیان دا دەڵێن: «ئەگەر ناتوانم سۆز و خۆشەویستیی دایک و بابم بۆ لای خۆم راکێشم لانی کەم دەبێ وا بکەم لێم بێزار بن»، یان «ئێستا کە ئەوان خۆشیان ناوێم با لانی کەم کارێکی وا بکەم نەفرەتی خۆیان بەرامبەر بە من دەربڕن». بە کورتی هەر تاوان و کردەوەیەکی خراپ کە لە منداڵ روو دەدا بە جۆرێک دەچێتەوە سەر بێبەش بوونی ئەو لە خۆشەویستی.

بێگومان هەر کردەوەیەکی جینایەتکارانە پیشاندەری ئەو رق و بێزاری‌یەیە کە لە ئەنجامدەری جینایەتەکە دا هەیە. بۆ تێگەیشتن لە ڕەگ و ریشەی تاوان کردنی منداڵان، دەبێ بە دوای ئەو هۆیانەدا بگەڕێین کە ئەوان تووشی قین لەزگی و بوغزاوی بوون، دەکەن. ئەو رق هەڵگرتن و بوغزاوی بوونەش دەگەڕێتەوە سەر نارەزامەندیی و زەبر وێکەوتنی منداڵ.

نابی ئەوەمان لە بیر بچێتەوە کە منداڵ بەر لە هەر شتێکی دیکە، بوونەوەرێکی خۆویستە و تەنیا خۆی دەبینێ. کاتێک «من» (Ego)ەکەی ئەو رازی و بێ گلەیی‌یە، ئەو کارانە ئەنجام دەدا کە ئێمە بە ئاکاری چاکیان دەزانین و کاتێک «من»ەکەی نارازی‌یە، ئێمە لەگەڵ دەعبایەکی لاسار و تاوان خواز بەرەوڕووین. لەراستی‌دا ئینسانی تاوانخواز کەسێکە کە تۆڵەی خۆی لە کۆمەڵێک کە نازانێ ڕێز لە

«من»ەکەی ئەو بنی، دەستێنێتەوە.

ئەگەر منداڵان زگماک غەریزەی بەدڕەفتاری و تاوانخوازی یان هەبایە، دەبوایە تاوان کردن لە نێو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵدا یانی لە نێو هەژاران و دەوڵەمەندان و نێوانجی یەکان و بنەماڵە بە فەرهەنگ و بێ فەرهەنگەکاندا وەک یەک بڕەوی بوایە. لە بنەماڵە دەست ڕۆیشتوو و تێر و تەسەلەکاندا ڕەزامەندیی «من» بە هاسانی دابین دەبێ. چونکە پێویستی یەکانی ئەنجامدانی چالاکی یە فەرهەنگی و هونەری یەکان کە نەخشێکی گرنگیان لە دابین کردنی ڕەزامەندیی «من» دا هەیە، بە هاسانی دەست دەکەون. هەر کاتێک ڕەزامەندیی «من» ی کەسێک بە هاسانی دابین نەبوو، ئەو کەسە بە نیازی خۆ نواندن لە وانەیە هەر جۆرە کارێک تەنانەت تاوانیش ئەنجام بدا.

زۆر کەس وابیر دەکەنەوە کە فیلمە لاری کەرەکان دەبنە هۆی پەیدا بوونی ئینسانە جینایەتکارەکان. ئەمن لەو پێوەندی یەدا بەراستی گومانم هەیە. چونکە فیلمێک لەوانەیە کەسێک بۆ ئەنجامدانی کارێکی خراپ ڕێنوێنی بکا، بەڵام بۆ ئەو مەبەستە دەبێ لە پێشدا هاندەر (انگیزە) ی ئەنجامدانی ئەو کارە خراپە لە کەسەکەدا هەبێ. لەراستی دا فیلمە لاری کەرەکان ئەو بەشە لە ئینسانەکان بەرەو ئەنجام دانی تاوان و جینایەت پاڵ پێوە دەنێن کە بیرو مێشکیان ئامادەیی ئەنجام دانی تاوان و جینایەتی هەیە.

بنەماڵە و کۆمەڵ لە ئاکامی هەڵس و کەوتی نادروستدا، تاوان و تاوانباری پەرە پێ دەدەن. ئێمە زۆر جاران لە خەیاڵی خۆماندا ئەو کەسانە لە نێو دەبەین کە خۆشمان ناوێن. بەڵام جینایەتکارەکان بە کردەوە ئەم مەبەستانە وەدی دێنن.

ئێرەیی بردن و سەرکوت کران، سەرچاوەی زۆر لەو کارانەن کە دژی کۆمەڵن. هیچ منداڵێک ناتوانێ سەرکوت کران تەحەممول بکا. ئەو پێی

خۆشە خۆشیان بوێ، سەرەشکێنە نەکرێ و بەردەوام تاریفی بکرێ. منداڵ بۆ راکێشانی سەرنجی کەسانی دیکە لە ئەنجام دانی هیچ جۆرە کردەوەیەک خۆ نابوێرێ. ئەو منداڵانەی لە کۆمەڵ دوورە پەرێز نین، هەوڵ دەدەن لە رێگای پێکەنین و هەڵپەرکێ و دەیان جۆرە چالاکیی دیکەوە پێویستیی خۆیان لە بارەی راکیشانی سەرنجی کەسانی دیکە دامرکێنن. بەڵام ئەو منداڵانەی دوورە پەرێزن و لە پاڵ خۆیان دان و لە هیچ جۆرە تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی‌دا بەشدار نابن بۆ ئەنجام دانی تاوان، ئامادەیی‌یەکی زیاتریان هەیە.

فشار و ستەم، هەستی رق هەڵگرتن و تۆڵە ستێنی بە هێز دەکەن و ئەوانەش کە جینایەت دەخوڵقێنن لەراستی‌دا تۆڵە لە بنەماڵە و کۆمەڵ و ئینسانەکان دەستێننەوە. بۆ ئەوەی تاوان کردن لە لایەن منداڵانەوە نەمێنێ، دەبێ ئەو شتانە نەهێڵین کە منداڵان بەرەو رق هەڵگرتن و تۆڵە ستاندنەوە پاڵ پێوە دەنێن. باشترین کاریش لەو پێوەندی‌یەدا ئەوەیە ئەوین و خۆشەویستیی خۆمانیان پێشکێش بکەین.

## دزی

دزی کردن لەو کارانەیە کە لەوانەیە هەم منداڵە ساخ و هاوکێشەکان ئەنجامی بدەن، هەم ئەو منداڵانە کە لەگەڵ نەخۆشی‌یە عەسەبی‌یەکان بەرەوروون. منداڵێکی ساخ و سروشتییش لەوانەیە دزی بکا. دزی کردنی منداڵێکی،ئەوتۆ لەو کاتانەدا روو دەدا کە لە ماڵێ‌دا لەگەڵ گیروگرفتی ماددی بەرەوروو دەبێ. لەو جۆرە کاتانەدا منداڵ هەوڵ دەدا لە هاسانترین رێگاوە واتە دزینی کەل و پەلی نێوماڵ، پێویستی‌یەکانی خۆی دابین بکا، یان دەیەوێ بەو داهاتەی لە رێگای دزی کردنەوە دەستی دەکەوێ لەگەڵ هاوالانی‌دا نەخشە و بڕیارە هاوبەشەکانی جێ‌بەجێ بکا. ئەو لە نێوان ماڵی خۆی و ماڵی کەسانی دیکەدا جیاوازی‌یەک بەدی ناکا. زۆر

لە قوتابیانی قوتابخانەکەمان لەو جۆرە دزی‌یانە (ئەگەر بکرێ ناوی دزی‌یان لەسەر دابنێین) دەکەن. زۆربەی ئەو دزی‌یانەی لە قوتابخانەکەمان دەکرێن ئەوانەن کە بە کۆمەڵ دەکرێن. وا دیتە بەرچاو کە منداڵان دزیی بە کۆمەڵ بە جۆرێک رووداو خولقێنی و کایە و شانۆ دەزانن.

منداڵ بەر لە هەر شتێکی دیکە بوونەوەرێکی خۆخوازە و تا پێ‌دەنێتە تەمەنی خۆناسین، نایەوێ سووک و سانا لەگەڵ کەسانی دیکەدا بگونجێ و ببێ بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی. ئەوە لە لای گەورانە کە هێندێک وشەی وەک «ئەمیان هی منە» ، «ئەویان هی تۆیە» مانای خۆیان هەیە. منداڵان بۆ ئەوەی ببن بە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی زۆر زیاتر لەو ماوەیەی بە بیری ئێمەدا دێ، پێویستی‌یان بە تێپەڕینی زەمان و چوونە سەری تەمەن هەیە. نابێ چاوەڕوان بین منداڵ رێز بۆ هەموو یاسا و رێ و شوێنە کۆمەڵایەتی‌یەکان دابنێ و بەڕێوەیان بەرێ. دەبێ ئەو دەرەتانەی پێ بدەین کە پێ بە پێی تەمەن فێری قانوونەکان بێ و بە دڵەوە بەڕێوەیان بەرێ. ئەگەر منداڵان ئازاد و سەربەست رابهێنرێن لە رەوتی زەمان‌دا دەبن بە ئینسانێکی باش و راست.

زۆر کەس هەن ئەگەر یەکێک لێ‌یان لە هەڵلا نەدا و کەس پێ‌نەزانێ، پێ‌یان خۆشە بۆ وێنە لە دانی کرێی ماشێن یان شەمەندەفەر خۆ بیوێرن. هی واهەن لە کاتی شت کڕین‌دا ئەگەر فرۆشەر حیسێبی لێ تێک بچێ و پوولێکی کەمتریان لێ داوا بکا، هەڵەکەی بۆ راست ناکەنەوە و پوولێکی کەمتر دەدەن. یان لە کاتی دانی مالیات‌دا وانیشان دەدەن کە داهاتێکی کەمیان هەیە بۆ ئەوەی یان هەر مالیاتیان لێ نەستێندرێ، یان پوولێکی زۆر کەم بدەن. بەڵام هەر ئەو جۆرە کەسانە کاتێک کە دەبیسنەوە، منداڵەکەیان بێ پرس کردن پوولێکی هەرچەند کەمیشی هەڵگرتوە، هاواریان دەگاتە ئاسمان، تەمبێی دەکەن و چەند

سەعات دەرسی ئەخلاقی بە گوێدا دەخوێنن. هەرگیز نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە منداڵان زۆر لەو جۆرە مەسەلانە تێ دەگەن و ئاکار و کردەوە و هەڵس و کەوتی ئێمە لە نێو کۆمەڵدا تاوتوێ دەکەن.

بەڵام ئەگەر دزی کردن لە لایەن منداڵێکەوە بەرێوە چووبێ کە گیروگرفتی ڕەوانی و عاتیفی هەیە، هۆیەکەی دەگەڕێتەوە سەر نەبوون یان کەم بوونی ڕێز و خۆشەویستی لە نێو بنەماڵەکەیدا و جڵەوی هاندەرەکان (محرکات) پشی لە دەست بەشی ئاگای مێشکی دانیە.

زۆربەی نزیک بە تەواوی ئەو دزییانەی لە لایەن منداڵانەوە کراون، ئەوە نیشان دەدەن کە منداڵی دەست پیس هەست دەکا کە دایک و باوکی خۆشیان ناوێ و لە ئەندامانی بنەماڵە هەڵیان هاواردوە. منداڵ ئەگەرچی پووڵ، زێڕ و جەواهیرات و شتی دیکەی دزیوە، بەڵام هاندەرەکان بە هۆی ئەم کارەوە، وەدەست هێنانی ڕێز و خۆشەویستیی دایک و باب و کەسانی دەوروبەریان لێ وەشتوە. لەو جۆرە کاتانەدا من بە جۆرێکی تایبەتی لە گەڵیان بەرەوروو دەبمەوە. بۆ وێنە ئەگەر قوتابییەک توتنی پیپم لێ بدزێ، من لە جیاتی ئەوەی سزای بدەم، خەڵاتیشی دەدەمێ. مەبەستم ئەوەیە لەم ڕێگایەوە هەستم بە هەستی نائاگای ئەو رابگا. ڕەنگە ئەو پێی وابێ کە بۆ کارێکی چەوت خەڵاتی دەکەم ئینسانێکی کەم فام و گەمژەم، بەڵام ئەوە گرنگ نیە کە لە بارەی منەوە چۆن بیر دەکاتەوە. گرنگ ئەوەیە کە ئەو هەست بە چی دەکا. بە هۆی ئەو کارەی منەوە ئەو وا هەست دەکا کە من خۆشم دەوێ و دۆستایەتیمان لە نێوانـدا هەیە و رقم لێی نیە. درەنگ یان زوو، ئەو منداڵە، دزیی لەبەرچاو دەکەوێ و وەک کردەوەیەکی بێ مانای دێتە بەرچاو. چونکە ئەو ڕێز و خۆشەویستییەی کە ئەو لە ڕێگای دزینی کەل و پەلی ماددییەوە بە شوێنیەوە بووە، بە شێوەیەکی سروشتی بۆی دابین بووە و هەر بۆیە پێویستییەکی بە دزی کردن نامێنێ.

لێرەدا پێویستە بڕێک زیاتر لەسەر خەڵات کردنی منداڵان سەبارەت بە دزی کردن بدوێم. ئەو منداڵەی دزی دەکا ئەگەر لە باری دەروونی و عاتیفیی‌یەوە گیروگرفتی زۆری هەبێ و یان هەر لەجێ‌دا ئینسانێکی لووت بەرز و لەخۆ رازی بێ، خەڵات کرانی سەبارەت بە دزی کردن ئاکامێکی خراپی دەبێ. لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا کە من لەگەڵ منداڵە خاوەن گیروگرفتەکان‌دا هەڵس و کەوتم هەبووە، بەو ئاکامە گەیشتووم کە ئەوان هەرکە هەست بە رێز و خۆشەویستی دەکەن، لە ئەنجام‌دانی کاری چەوت و نالەبار دەگەڕێنەوە. بەڵام ئەو منداڵانەی گیروگرفتە دەروونی‌یەکانیان زۆر ئاڵۆزە و بە شێوەیەکی نەخوازراو تووشی دزی دەبن، بە خەڵات کردن لە دزی ناگەڕێنەوە و بۆ ئەوەی واز لەم کردەوەیە بێنن دەبێ پزیشکی دەروونناس پێ‌یان رابگا.

ماوەیەک لەمەوبەر کوڕێکی شازدەساڵەیان هێنایە قوتابخانەی ئێمە. ئەو منداڵە فێرە دزی کردن ببوو و لەو کارەش‌دا زۆر چووبووە پێش. کاتێک گەیشتە قوتابخانە بلیتێکی نیوە کرێی شەمەندەفەری پێشان دام کە بابی بۆی کڕیبوو تا پێی بگاتە قوتابخانە. لێم پرسی: ئەوە بۆچی بلیتی نیوە کرێت کڕیوە؟ خۆ تۆ تەمەنت لە پازە ساڵ تێپەڕیوە و دەبوایە بلیتی تەواوت کڕیبا. گوتی بابم لە وێستگە درۆی لەگەڵ بلیت فرۆشەکە کرد و وای نیشان دا کە من تەمەنم لە پازدەساڵ کەمترە. لێرەدا حەز دەکەم خاڵێک وەبیر بێنمەوە ئەویش ئەوەیە ئەو دایک و بابانەی منداڵی نالەبار و دەست پیسیان هەیە پێویستە بە شێوەیەکی جیددیتر لە رەفتاری خۆیان وردبنەوە و ئاگادار بن کە کردەوەی ئەوان شوێنەواری گرنگ لەسەر منداڵانیان دادەنێ.

بەڵام مەسەلەی گرنگتر ئەوەیە کە گەورەساڵان کاتێک دەیانەوێ منداڵانیان لە تەمەنی ٦ ساڵی‌دا بنێنە بەر خوێندن و فێر بوون، ئیدی بایەخێکی ئەوتۆ بە ژیانی عاتیفیی ئەوان نادەن. کەچی دەبێ بزانین

ئەگەر منداڵێک کردەوەیەکی دەست پیسانە، یان هەر لارێیی‌یەکی دیکەی لێ روودا، زۆرجار لەبەر رووبەروو بوون لەگەڵ بێ عاتیفەیی و کەم بوونی خۆشەویستی‌یە. منداڵێکی هاوکێش (متعادل) کە لە نێو بنەماڵەدا هەست بە کەم‌بوونی خۆشەویستی نەکا، بە دەگمەن دەکەوێتە بیری دزی کردن یان هەر کردەوەیەکی لارێیانەی دیکە.

دزی لە لایەن منداڵانەوە تا رادەیەکی زۆر، لە کەم بوونی خۆشەویستی و رانەگەیشتنی دایک و بابەکان بە پێویستی‌یە عاتیفی‌یەکانی ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەگەر دایک و بابەکان بیانەوێ ئەو گیروگرفتە نەهێڵن دەبێ مەسەلەکە بە شتێکی زۆر گرنگ بزانن و دڵنیابن ئەگەر زیاتر بە منداڵانیان رابگەن و بایەخ بە پێویستی‌یە عاتیفی‌یەکانی ئەوان بدەن، ئەو گیروگرفتەیان لە کۆڵ دەبێتەوە. دیارە مەرجی ئەو کارەش ئەوەیە کە بۆخۆشیان لە ژیان‌دا نموونەی راست وپێی و ئاکار جوانی بن و لە لارێیی و کردەوەی چەوت دوور بووبن. ئەگەر وا نەبێ واتە ئەگەر دایک و باب لە ژیانی رۆژانەدا هەزاران جار کردەوەی چەوت و ناحەزیان لێ روویدا، ناتوانن ئەو چاوەروانی‌یەیان لە منداڵەکەیان هەبێ کە تووشی ئاکار و کردەوەی دزێو نەبێ. دایک و بابەکان لە روانگەی منداڵانەوە باشترین نموونەن بۆ ئەوەی لاسایان بکرێتەوە. کەوابوو گیروگرفتی ئەوان پێوەندیی بە دایک و بابەکانیانەوە هەیە و چارەسەر کرانیشی بەستراوەتەوە بە گۆڕانی رەفتار و هەڵس و کەوتی دایک و بابەکان.

## دەروونناسی و دەرمانی منداڵ

لە روانگەی دەروونناسی‌یەوە چارەسەرکرانی نەخۆشی، زیاتر لەوەی بە دوکتوری دەروونناسەوە بەسترابێتەوە، بە نەخۆشەکە خۆیەوە بەستراوەتەوە. ئەگەر زۆر جار دوکتورە دەروونناسەکان ناتوانن

نەخۆشەكانیان چارەسەر بكەن هی ئەوەیە كە نەخۆشەكە لە سەر ویستی خۆی نەچۆتە لای دوكتور و كەس و كارەكەی زۆری‌یان لێ كردوە و ناچاریان كردوە خۆی نیشان دوكتور بدا. بۆ وێنە ئەگەر پیاوێك ژنەكەی - كە بۆ خۆی نەگەیشتۆتە ئەو ئاكامە پێویستیی بە دوكتوری دەروونناسی هەیە - بە زۆرە ملی و بە پێچەوانەی ویستی خۆی بنێرێتە لای دوكتور، ئاكامێكی پێچەوانە لەو كارە وەردەگرێ. چونكە ژنەكە لای خۆی وای لێك دەداتەوە كە: مێردەكەم رەفتاری منی بە دڵ نیە و دەیەوێ بە هۆی دوكتوری دەروونناسەوە پێمی بگۆڕێ و منیش حەز ناكەم رەفتاری خۆم بگۆڕم. دیارە لە وەزعێكی ئاوادا دوكتوری دەروونناس ناتوانێ هیچ هەنگاوێكی بەكەڵك باوێژێ.

مێرمنداڵە تاوانبارەكانیش كاتێك بە زۆر و نابەدڵی دەنێردرێنە لای دوكتوری دەروونناس، هەر لەگەڵ وەزعێكی لەم چەشنە بەرەوروو دەبن. ئەوانیش هەروەك گەوران دەبێ بەرلەوەی بچنە لای دوكتوری دەروونناس، مەیل و هەستی پێویستیی چارەسەر كران و چوون بۆ لای دوكتوریان تێدا پێك هاتبێ. بە بڕوای من ئەو منداڵانەی گیروگرفتی بچووك و كەم بایەخیان هەیە، زۆر جار پێویستی‌یان بە چوونە لای دەروونناس نیە و ئەگەر هەست بە خۆشەویست بوون بكەن و ئازادی‌یان بدرێتێ و (هەروا كە لە لاپەرەكانی پێشتردا گوتوومە) سەربەخۆ پەروەردە بكرێن، گیروگرفتەكانیان چارەسەر دەبن. دیارە مەبەست لە ئازادی، بەرەڵایی و بێ‌سەرەوبەرەیی نیە و دەبێ لە نێوان ئازادی و بەرەڵایی‌دا سنوور دابنرێ. لەو بارەیەوە لێرە بە دواوەش روون كردنەوەم دەبێ.

چەند ساڵ لەمەوبەر قوتابی‌یەكیان بە ناوی «ئارتۆر» كە لە قوتابخانەكەی پێشووی‌دا، كەل و پەلی دۆستانی خۆی دزیبوو، بۆ چارەسەر كردن ناردە لای من. حەوتوویەك دوای هاتنی بۆ قوتابخانەكەمان كەسێك تەلەفونی بۆ كردم و گوتی: «ئەمن مامی

ئارتۆرم و داوا دەکەم ئەگەر دەکرێ ڕێگای بدەن بۆ تێپەڕ کردنی ڕۆژانی پشـوودان چەند ڕۆژێک بێتە ماڵی من لە لیڤرپول». لە وەڵام دا گوتم: دیارە دەتوانی بێ بۆ لاتان. تاقە مەسەلەیەک کە هەیە کڕینی بلیتی سەفەرەکەیەتی کە نازانم کێ دەیدا. واباشە لەو بارەیەوە جەنابت لەگەڵ دایک و بابی قسە بکەی و لە ئاکامەکەی ئاگادارم بکەیەوە.

بۆ سبەینێ دایکی کوڕەکە تەلەفونی بۆ کردم و گوتی مامی ئارتور پێوەندیی بەوانەوە کردوە و ئەوان ڕازین کە کوڕەکەیان چەند ڕۆژێک لە لای مامی بمێنێتەوە. لە کۆتایی قسەکانی‌دا داوای لێ کردم ئەگەر دەکرێ لە گیرفانی خۆم سێ پاوەند بۆ کڕینی بلیت بدەم بە ئارتور. منیش سێ پاوەندم دا بە ئارتور تا بەیانی بۆ سەردانی مامی پێی بچێتە لیڤرپول. بەڵام هەر ئەو ڕۆژە بۆ ئێواری بۆم دەرکەوت کە هەردووک تەلەفونەکە، بە هۆی ئارتورەوە کراون. ئەو ئەوەندە بە باشی توانیبووی لاسای دەنگی دایک و پیرەمامەکەی بکاتەوە کە منیشی هەڵ خەڵەتاندبوو.

لەو بارەیەوە لەگەڵ ژنەکەم کەوتمە ڕاوێژ و هەر دووکمان گەیشتینە ئەو ئاکامە کە ئەگەر پووڵەکەی لێ بستێنینەوە و بە توندی لەگەڵی بجووڵێینەوە، ناگەینە ئاکامێکی باش. چونکە لە قوتابخانەکانی پێشووش‌دا هەر بەم چەشنە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کردوە و دژ کردەوەی ئەو، جار لەگەڵ جارێ خراپتر بووە. لە جیاتی ئەو ڕێ چارەیە، ژنەکەم پێشنیاری پێ کردم کە دەسخۆشانەشی بدەمێ. هەر بۆیە شەوێ لە دیوەکەی وەژوور کەوتم و زۆر بە ڕووخۆشی‌یەوە گوتم: هەر دەڵێی ئەمڕۆ بەختت هەستاوە.

گوتی: ڕاست دەکەی!

پێم گـوت: زیاتر لەوەی بیـری لێ دەکـەیەوە بەخت ڕووی تێ کردووی!

گوتی: مەبەستت چیە؟

زۆر بە جیددی گوتم: دایکت ئێستا تەلەفونی بۆ کردم و گوتی لە جیاتی سێ پاوەند چوار پاوەندت بدەمێ.

بێ ئەوەی وەسەرخۆمی بێنم پاوەندێکی دیکەم هاویشتە سەر جێ و بانەکەی و پێش ئەوەی هیچ قسەیەکی لە زاری بێتە دەر، لە ژوورەکەی وەدەرکەوتم.

بۆ رۆژی دوایی، ئارتور بەر لەوەی بەرەو لیـــورپول وەڕێ بکەوێ نامەیەکی بۆ نووسیبووم و دابوویە دەست راهێنەری قوتابخانە و پێی گوتبوو: پاش ئەوەی شەمەندەفەر وەڕێ کەوت نامەکەی بدەیە. نامەکەی بەم جۆرە دەست پێ کردبوو: «نیلی بەڕێزا تۆ زۆر لەمن باشتر لە فێلان دەزانی!» پاش ئەوەی لە سەفەر گەڕایەوە هەموو رۆژێ لێی دەپرسیم لە حـاڵێکـدا دەتزانی درۆم لەگـەڵ کـردووی و تەلەفـونەکـان بۆ خـۆم بۆم کـردووی، بۆچی پاوەندێکی دیکەشت دامێ؟ تا چەند حەوتوو رابرد من وەڵامێکم نەدایەوە و سەرئەنجام رۆژێک لێم پرسی: «ئەرێ بەراستی ئەو کـاتەی پوولەکەم پێ دای چ هەسـتێک دایگـرتی؟» زۆر بە جـیددی دەبیـرەوە چوو و پاشـان زۆر بە هێمنی گـوتی: «ئەوە توندترین زەبر بوو کە لە درێژایی ژیان‌دا وێم کەوت. لە دڵی خۆم‌دا دەم‌گوت ئەو کابرایە یەکەم مرۆڤە کە بووبێتە پەنا و پشتیوانم». لەو کات بەدواوە لە نێوان من و ئەودا هیچ گیروگرفتێک نەهاتە پێش و ئەویش بەڕای بەڕای بە لای کار و کردەوەی دزێو و لاڕێیانەدا نەچۆوە.

ئەو کوڕە دەیزانی کە ئەو ئۆگری و خۆشەویستی‌یەی بەرامبەر بەو دەرم بڕی نیشانەی تەئیید کردنی شەخسییەتی ئەو لە لایەن منەوەیە و بە تێگەیشتن لەو راستی‌یە کە من پشت و پەنای ئەوم، پێویستی‌یەکی بە فریو دانی من و کەسانی دیکە نەما. بۆ ئەوەی ئەو منداڵ و مێرمنداڵانە کە کاری دزێویان لێ روو دەدا، بەو ئاکامە بگەن کە گەورەکان لایەنگر و پشتیوانیانن، وەختێکی زۆر پێویستە و دەبێ چەندین مانگ راوەستین تا

ئەو ئاکامە بێتە دەست. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ڕێگا چارەیەکی گشتی نیە کە وەڵامدەری گیروگرفتی هەموو منداڵان بێ. هەر منداڵەی بە گوێرەی بارودۆخی بنەماڵەیی و کۆمەڵایەتیی خۆی دەبێ لە لایەن ●ێکان و کەس و کاریەوە ڕێگاچارەی تایبەتی بۆ دەست نیشان بکرێ. لە قوتابخانە جارێک یەکێک لە قوتابییە کۆنەکان لێی پرسیم: دەکرێ لە کۆبوونەوەی گشتیی قوتابخانەدا مەسەلەی دزرانی پووڵەکەی لە لایەن «بیل» قوتابیی تازەی قوتابخانەوە، بێنیتە بەرباس؟ ئەمن دەست بەجێ وەڵامم دایەوە «نا، بۆخۆم لە مەسەلەکە دەکۆڵمەوە». بۆیەش بەم جۆرە وەڵامم دایەوە چونکە «بیل» تازە هاتبووە قوتابخانەکەمان و هێشتا بەو ئازادییە کە لەوێ هەبوو ڕانەهاتبوو و لەو فەزا تازەیەدا هەستی بە ئاسوودەیی نەکرد. ناوبراو زۆری خۆ زەحمەت دابوو تا لە دڵی قوتابییەکاندا جێی خۆی بکاتەوە و هێندێک دۆستیان لە نێودا پەیدا بکا. بۆیە ئەگەر کردەوە ناحەزەکەی لە کۆبوونەوەی گشتیدا خرابایە بەرباس لەوانەبوو تەریق بێتەوە و جارێکی دیکە نەیەتە کۆبوونەوە. یان بە پێچەوانە، شانازی بە کارەکەیەوە بکا و لەو ڕێگایەوە بیەوێ خۆی وەک ئینسانێکی توند و تیژ نیشان بدا تا هەموان لێی بترسێن. ئەوەش کارێک بوو کە لە قوتابخانەی پێشوو زۆر جاری دیکە ئەنجامی دابوو.

بەڵام جارێکی دیکە کە قوتابییەک پێی گوتم دەیەوێ مەسەلەی دزرانی قەڵەمە ڕەنگییەکانی لە لایەن «مێری»یەوە لە کۆبوونەوەی گشتیی قوتابخانەدا بێنیتە گۆڕێ، پێم گوت چۆنت پێ خۆشە وا بکە. بۆیەش ئەو وەڵامەم دایەوە چونکە مێری چەند ساڵ بوو پانسیۆنی قوتابخانەکەمان بوو و بەباشی دەیتوانی لە کاتە ئەستەمەکاندا دیفاع لە خۆی بکا و ئەم جۆرە قسانە شوێنێکیان لەسەر شەخسییەتی ئەو دانەناوە.

ساڵی ڕابردوو قوتابییەکی سێزدە ساڵە کە لە هەموو تەمەنیدا لە چوونە قوتابخانە خۆی بواردبوو و لە خوێندن بێزار بوو هاتە

قوتابخانەكەمان. ئێمە لە قوتابخانە ئازادی‌یەكی تەواومان داپە و هەر لە جێ‌دا لێمان نەویست بچێتە سەر كلاسی دەرس خوێندن. ئەو چەند حەوتوو لە دەورو بەری قوتابخانەدا بە یاری كردن رای‌بوارد تا وای لێ‌هات تاقەتی چوو. سەرەنجام رۆژێک هاتە لام و پێی گوتم: «تەكلیفی من چیە، من دەچمە قوتابخانە یان نا؟» پێم گوت: ئەوە بە دەست خۆتە كە دەچی یان نا، ئەو مەسەلەیە پێوەندی‌یەكی بە منەوە نیە». ئەو دەبوایە بۆ خۆی پێویستی‌یە دەروونی‌یەكانی خۆی، دەست نیشان كردبان. وەک دیتمان دەست نیشانیشی كردن و لەو كات بەدواوە بەردەوام لە سەر كلاسەكانی دەرس خوێندن ئامادە دەبوو. ئەوە لە حاڵێک داپە كە ئەگەر قوتابی‌یەكی دیكە هەر ئەو پرسیارەی لێ كردبام لەوانە بوو وەڵام بداتەوە: بەڵێ ئەتۆ دەبێ بچیە سەر كلاسی دەرس و واو وا بكەی. چونكە ئەو قوتابی‌یەی وەڵامێكی ئەوتۆی دەداتەوە، دایک و بابەكەی بە باشی دەناسم و دەزانم كە ئەوان بەرنامەی دەرسی رۆژانەی زۆر بە وردی بۆ دیاری دەكەن. هەر بۆیە لەگەڵ هاتن بۆ قوتابخانەكەمان و هەست كردن بەو ئازادی‌یە كە لە قوتابخانەكەمان‌دا هەیە، ناتوانێ بە دڵنیایی و بە خێرایی بڕیاری خۆی بدا. ئەو زەمانێكی تا رادەیەک درێژی پێویستە تا بتوانێ بڕوا بە خۆ بوون لە خۆی‌دا بە هێز بكا و ئامادەیی پێویستی بە مەبەستی دانی بڕیاری گرنگ لە پێوەندی لەگەڵ كاروباری خۆی‌دا تێدا پێک بێ.

كاتێک ئێمە بڕیار دەدەین رێز و خۆشەویستی و سەربەستی پێشكێشی منداڵان بكەین ماناكەی ئەوەیە كە لە گەڵیان داین و ئاكار و كردەوەكانیان تەئید دەكەین. ئەمن دەزانم كە منداڵان زەمانێكی دوور و درێژیان پێویستە تا لە جیاوازیی نێوان ئازادی و بەرەڵایی تێ بگەن، بەڵام دڵنیام كە ئەوان توانای تێگەیشتنی ئازادی‌یان هەیە و لە درێژخایەن‌دا لە مانای ئازادی دەگەن.

# فەسڵی شەشەم:

## گیرو گرفتەکانی دایک و باب

* خۆشەویستی و دوژمنایەتی
* منداڵی رووهەڵماڵاو
* هێز و دەسەڵات لای منداڵان
* ئیرەیی
* نیگەرانیی دایک و بابەکان
* ناسرانی منداڵان لە لایەن دایک و بابەکانیانەوە .

## خۆشەویستی و دوژمنایەتی

سەرچاوەی تێگەیشتنی منداڵ دایک ، باب، مامۆستای قوتابخانە و کەسانی دەوروبەریەتی. کاتێک لە نێوان ئەو تێگەیشتنە و سروشتی تایبەتیی منداڵدا ململانێ پێک دێ، دەروونی منداڵ تووشی نەخۆشی دەبێ. بە وتەی «فرۆید» نەخۆشیی دەروون لە ئاکامی تێکهەڵچوونی نێوان «من» (Moi) و «لە من گەورەتر» (Sur- Moi) دا پێک دێ.

خۆشەویستی و دوژمنایەتی دژی یەک نین. دژ، یان پێچەوانەی خۆشەویستی، بێ لایەنییە. دوژمنایەتی ئەو ئۆگرییەیە کە کەند و کۆسپ لارێی کردوە. لە دوژمنایەتی یان بوغزاندندا هەمیشە دیاردەی ترسیش خۆی مەڵاس داوە. کاتێک منداڵێک برا یان خوشکی لە خۆی چووکتری دەبوغزێنێ، هۆی ئەوەیە کە ترسی ئەوەی هەیە کە دایک، برا یا خوشکی لەو بچووکتری زیاتر خۆش بوێ. هەر بۆیە بەرامبەر بە کردەوەکانی ئەو دژ کردەوە لە خۆی نیشان دەدا و ئیرەیی پێ دەبا. ئەو ئیرەیی پێ بردنە شوێنێکی وای لەسەر دادەنێ کە ئاواتی نەمانی برا یان خوشکی لە خۆی چووکتر لە مێشکیدا پەروەردە بکا. بەو هۆیەش کە دەزانێ پەروەردە کردنی ئەو جۆرە خەزگانە لە مێشکدا کارێکی ناڕەوایە، هەمیشە لەگەڵ خۆیدا لە ململانێدایە و هەوڵ دەدا ئەو جۆرە بیرانە لە خۆی دوور بکاتەوە. ئەو وەزعە ماندوو و هیلاکی دەکا و ئەوەش ڕاست ئەو شتەیە کە ئەو لێی دەترسێ.

نابێ بوغـزاندنی جاروباری دایک و بابەکان لە لایەن منداڵەوە لە دین دەرمان بکا، چونکە ئەو مەسەلەیە دەگەڕێتەوە سەر ڕەفتاری دایک و باب لەگەڵ منداڵەکەیان، لەو کاتەدا کە ئەو چووکە بووە یان ئەو کات کە بوونەوەرێکی خـــۆویست بووە. منداڵ لەو کـــاتدا بە شـــوێن ڕێز و خۆشەویستی و داسەپاندنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەوروبەری دابووە و کاتێک دایک و باب لە دەستانی جاڕز بوون و تەمبێیان کردووە، وای هەست کردووە کە لە خۆشەویستیی دایک و باب بێبەشە. هەر جارێک کە دایک بەسەریدا ڕووخاوە یان باوک بەسەریدا گوڕاندوە کە فلانە کار نەکا، ئەو پێی وابووە کە ئەوان ئیدی خۆشیان ناوێ.

منداڵ کاتێک نەتوانێ ڕێز و خۆشەویستیی دایک و بابی وەدەست بێنێ، هەوڵ دەدا ڕق و تووڕەیی ئەوان لە دژی خۆی ببزوێنێ. ئەو لە دڵی خۆیدا دەڵێ ئێستا کە دایکم زۆرتر بە خوشکە چکۆڵەکەم ڕادەگا و منی بە تەواوی لە بیر خـۆی بردۆتەوە، ئەمنیش ناچاری دەکەم بە جـۆرێکی دیکە سەرنجی بۆ لای من ڕابکشێ. هەر بۆیە بە شەقان وەردەگەڕێتە دەرگا، کەل و پەلەکان دەشکێنێ و سەدان کاری نابەجێی دیکە ئەنجام دەدا تا هەر نەبێ بۆ تەمبێ کردن و بەسـەر ڕۆیشتن، دایکی ڕووی تێ بکا. هەمـوو ئەو گیـرو گـرفـتـانەی لە ڕەفـتـاری منداڵاندا هەن، سەرچاوەکـەیان هەست کـردنی منداڵ بە نەبوونی خـۆشـەویسـتی و پێڕاگەیشتنە. بەڵام تەمبێ کردن و سەرکۆنە کردنی منداڵ لەسەر ئەو جۆرە کارانە، هیچ دەردێک دەرمان ناکا. ئەم جۆرە دژکردەوانە منداڵ بوغزلەزگتر دەکەن. زۆر جارانیش منداڵ لەبەر ئەوەی دەروەستی دایک و بابی نایە، تۆڵەی خۆی لە خوشک یان برای چووکتری خۆی دەستێنێتەوە و ئەوان تەمبێ دەکا و لەوانەشە داخی دڵی خۆی بە هەر زیندەوەرێکی نێومالْ وەک پشیلە و ... بڕێژێ و ڕق و کینەی خۆی بەم جۆرە دەربڕێ. چونکە لەوانەیە بۆ ماوەیەک بکرێ بێزاری و ڕق لێ بوون سەرکوت بکرێ

بەڵام بەو هۆیە کە هەر هەستەی دەبێ بە شێوەیەک دەربەڕێ هەربۆیە منداڵی سزادراو داخی دڵی خۆی بەوانە دەڕێژێ کە لەو بچووکترن و ناتوانن لە بەرامبەری دا دەست بکەنەوە.

ئەو دایک و بابانەی چاوەڕوانی ئەوەن منداڵەکەیان ئەمەگناس بێ، سروشتی منداڵ و قۆناغی منداڵییان بە باشی نەناسیوە. منداڵان زۆر لەوە بێزارن کە خۆیان بە قەرزداری کەسێکی دیکە بزانن. دایک و بابەکان دەبێ بێ ئەوەی چاوەڕوانیی ئەمەگناسی و پێزانینیان لە منداڵەکانیان هەبێ، یارمەتییان بدەن. ئەو دایک و بابانەی بەو نیازە کە منداڵانیان ئەمەگی ئەوانیان لە چاوان دا دەبێ، هێندێک کاریان بۆ دەکەن، زۆربەیان جگە لە ناکامی چی دیکەیان پێ نابڕێ. بێرنارد شاو دەڵێ: «ئێمە ناتوانین خۆمان فیدای کەسانی دیکە بکەین بێ ئەوەی لە بەرامبەر ئەو فیداکاری و لە خۆبوردوویی‌یەدا، رقمان لێیان نەبێتەوە». دەکرێ ئەو وتەیەی بە جۆرێکی دیکە بڵێین : «ئێمە ناتوانین خۆمان بکەینە قوربانیی کەسانی دیکە بێ ئەوەی ئەوان لەو خۆ فیداکردنەی ئێمە هەست بە بێزاری نەکەن».

بە کورتی دەتوانین بڵێین هەموو منداڵێک بەباشی هەست بەوە دەکا کە تەمبێ کرانی ئەو لەگەڵ بێزار بوون لەو، یەک مانای هەیە و هەر جارێک کە تەمبێ دەکرێ، رق و بێزاریی ئەو لە ئێمە پتر دەبێ. رەنگە تا ئێستاش من بەو جۆرەی پێویستە پێم لەسەر ئەو راستی‌یە دانەگرتبێ کە بوغزاندن، ئاکام و بەروبووی رق لێ بوونە و خۆشەویستی بەری میهر و موحیببەتە. تا ئێستا گیروگرفتی هیچ منداڵێک بە بوغزاندن چارەسەر نەبووە. بەڵام بە ئەوین و خۆش ویستن زۆر لە گیروگرفتەکانی منداڵان چارەسەر کراون.

## منداڵی رووهەڵماڵاو

منداڵی رووهەڵماڵاو و لە خۆرازی-بەرهەمی کۆمەڵێکی فاسید و خراپە. لە کۆمەڵێکی ئەوتۆدا منداڵی رووهەڵماڵاو بەترسەوە بە ژیانەوە دەنووسێ. دایک و بابی منداڵی رووهەڵماڵاو لە جیاتی دانی ئازادی بە منداڵەکەیان، پێشی منداڵەکەیان بەرەڵڵا دەکەن تا هەرچی پێی خۆشە بیکا. ئازادیی راستەقینە ئەو ئازادییەیە کە کەسانی دیکە تووشی زەحمەت نەکا و نەبێتە هۆی پێشێل کردنی ئازادیی ئەوان. منداڵی رووهەڵماڵاو مانای ئازادیی راستەقینە کە بریتی‌یە لە رێزدانان بۆ ماف و ئازادی‌یەکانی کەسانی دیکە، تێ ناگا.

منداڵی رووهەڵماڵاو لە حاڵی خۆی و کۆمەڵەکەی بەلایە. لە شەقامەکاندا، شەق لە لاقی کەسانی دیکە هەڵ دەدا، لە دزین و هەڵگرتنی ماڵی خەڵکی ناپرینگێتەوە، لەسەر پلیکانی ئاپارتمانەکان قیژە قیژ و دەنگ و هەڵلا وەرێ دەخا و تۆزقاڵێکیش چی‌یە گوێ ناداتە قسەی دایک و بابی کە داوای لێ دەکەن دابسەکنێ.

منداڵی رووهەڵماڵاو کاتێک کە گەورەتر دەبێ، هەموو کارێکی لەبەر گران دەبێ. ئینسانیکی خۆ بین و لە خۆرازی‌یە و وابیردەکاتەوە کە هەموو خەڵک بۆ خزمەتی وی هاتوونە سەر دنیا. لەو جۆرە کەسانەیە کە هەر گەیشتنەوە ماڵێ هەر پارچەیەک لە جل و بەرگی خۆیان فڕێ دەدەنە قوژبنێک و یەکێکی دیکە دەبێ جل و بەرگ و کەل و پەلەکانیان بۆ رێک و پێک بکا.

زۆر جاران، منداڵی رووهەڵماڵاو، گولە جەرگەی ماڵێ‌یە و لەبەر ئەوەی لە ماڵێدا کەسێکی هاوتەمەن نیە یاریی لەگەڵدا بکا، سروشتی‌یە کە هەوڵ بدا رەفتاری خۆی لەگەڵ هی دایک و بابی‌دا رێک بخا. دایک و بابەکانیش وەک بلیمەت و یەکێک لە شتە سەیر و سەمەرەکانی دنیا سەیری دەکەن و لەم رێگایەوە هانی دەدەن تا خۆی عاقڵتر و کامڵتر لە

تەمەنەكەی نیشان بدا و بۆ ئەوەی نەكا لە دەستی دایک و بابی نارەحەت بێ، هەرچی بیهەوێ دەی‌نێنە بەر دەستی.

ئەم جۆرە رەفتارە لەگەڵ منداڵان، لە هێندێک لە مامۆستاكانیش‌دا دەبینرێ. ئەوان قوتابی‌یەكانیان ئەوەندە روودار ڕادێنن كە لە تام دەچنە دەر و گوزەرانیان لەگەڵ ناكرێ. لە راستی‌دا ئەوان دەیانەوێ لەنێو قوتابیانیان‌دا خۆشەویست بن و وەک مامۆستایەكی باش سەیریان بكرێ. ئەوان لەوە دەترسێن ئەگەر هەموو داخوازەكانی قوتابیانیان جێ‌بەجێ نەكەن، رێز و خۆشەویستیی خۆیان لەدەست بدەن.

نابێ هەر شتێک منداڵ داوای كرد بخرێتە بەردەستی. لە سەردەمی ئێستادا، زۆر لە بنەماڵەكان زیاتر لە رادەی پێویست خەرجی گیرفان دەدەن بە منداڵانیان. ئەو دایک و بابانەی هەرچی منداڵەكەیان داوا دەكا، بۆی دابین دەكەن زۆرتر ئەوانەن كە منداڵەكەیان خۆش ناوێ بەڵام دەیانەوێ لەو رێگایەوە بێ‌بەشیی منداڵ لە خۆشەویستیی دایک و باب، بەدانی دیاری و خەڵات بە منداڵ قەرەبوو بكەنەوە. منداڵی رووهەڵماڵاو كەم وا هەیە ئەمەكی ئەو جۆرە خەڵاتانەی لە چاودابێ و كاتێک دیاری‌یەكی دەدەنێ زۆر زوو لەبەرچاوی دەكەوێ. دایک و بابێک كە بۆخۆیان نەیان‌توانیوە لە ژیانیان‌دا كارێكی گرنگ ئەنجام بدەن، پێ‌یان وایە منداڵەكەیان ئەگەر لێهاتوویی فێر بوونی كارێكی تایبەتیشی نەبێ، بە رووهەڵماڵاو بار هێنان دەتوانن بۆ لای فێر بوونی ئەو كارەی راكێشن. ئەوان لە دڵی خۆیان‌دا دەڵێن: دایک و بابی ئێمە نەیان هێشت هەر كارێكی پێمان خۆشە بی‌كەین، ئێستا كە خۆمان بووین بە دایک و باب، هەموو ئیمكاناتێک بۆ منداڵەكەمان دابین دەكەین تا بتوانێ هەر شتێكی پێی خۆشە فێری ببێ. لەراستی‌دا ئەوان دەیانەوێ بێ‌بەشی‌یەكانی خۆیان لە منداڵەكەیان‌دا بدۆزنەوە و هەر ئەو هۆیەشە بۆ وێنە بابێک كە لە ژیانی خۆی‌دا لە فێربوونی موسیقا بێ‌بەش بووە یان هەر لە جی‌دا ئۆگری

موسیقا نیه، وای لیٚ دەکا لەسەر پیانۆ فێربوونی کوڕەکەی پیٚ دابگریٚ. یان دایکێک هان دەدا کچەکەی بنێرێتە کلاسی فێربوونی سەما، تەنانەت ئەگەر ئەو کچە لێهاتوویی فێربوونی سەما و مۆسیقاشی نەبیٚ. بەو جۆرە زۆر لە دایک و بابەکان، زۆری لە منداڵەکانیان دەکەن فێری ئەو شتانە بن کە تۆزقاڵێک حەزی لیٚ ناکەن.

جۆرێکی دیکە لە مندالانی رووهەڵماڵاو ئەوانەن کە دایکەکانیان نایانەویٚ لەو راستی‌یە بگەن کە منداڵەکانیان هەروا نامێننەوە و گەورە دەبن. ئەم جۆرە دایکانە هەمیشە لەوە بەگلەیین کە منداڵەکانیان زوو گەورە دەبن و ئاواتیان ئەوەیە پێوەندیی منداڵی لەگەڵ ئەوان بۆ هەتا هەتایە بپارێزن.

منداڵ نابیٚ مافی ئەوەی هەبیٚ دەستدرێژی بکاتە سەر مافی کەسانی دیکە. ئەو دایک و بابانەی حەز ناکەن منداڵی رووهەڵماڵاویان هەبیٚ دەبیٚ لە نێوان ئازادی و بەرەڵڵایی‌دا سنوور دانێن و منداڵانیان فێر بکەن کە رێز بۆ ماف و ئازادی‌یەکانی خەڵکی دیکە دابنێن.

## هێز و دەسەڵات لای منداڵان

پێش ئەوەی نەخشی هەستی نائاگا (ناخودآگاه) لە مرۆڤدا بۆ زانستی دەروونناسی ئاشکرا بیٚ، وا دادەنرا کە منداڵ بوونەوەرێکی بەیار و خاوەن عەقڵە، دەتوانیٚ چاکە و خەراپە لێک جویٚ بکاتەوە و مێشکی وەک مۆم نەرم و ئاڵ و گۆڕ هەڵگرە و هەر مامۆستایەکی ئەرکناس دەتوانیٚ چۆن پێویست بیٚ ئاوا رای بێنیٚ بیٚ ئەوەی لەگەڵ هەر جۆرە دژکردەوەیەک بەرەوروو بیٚ.

بەڵام ئێستا بۆمان دەرکەوتوە کە هیچ شتێکی منداڵ لەسەر بارێک نامێنێتەوە. چونکە بوونەوەرێکی زیندوویە و هەوڵ دەدا مەیل و داخوازەکانی خۆی لە قالبی ئەو کارانەدا کە ئەنجامیان دەدا وەک یاری

کردن و نیگارکیشی و ... دەربڕی. پێویستە بزانین کە منداڵ هەر بە سروشت بوونەوەرێکی خۆخوازە و هەمیشە هەوڵی ئەوەیەتی رادەی دەست ڕۆیشتوویی دەسەڵاتی خۆی بەسەر کەسانی دیکەدا، تاقی بکاتەوە.

گەورەکان پێشی هەراو قریوە سازکردنی منداڵان دەگرن و سەرکوتی دەکەن. بەڵام بەر لەو سەرکوتکرانە، منداڵ لەگەڵ سەرکوتێنکی گرنگتر کە پێوەندیی بە کـاری دەست بە ئاوەوە هەیە بەرەوروو دەبێ. ئێمە هەر ئەوەندەمان لەدەست دێ کە بزانین کردەوەی خۆ خاڵی کردن لە روانگەی منداڵەوە، چ بایەخێکی گرنگی هەیە. لەراستی‌دا منداڵ وەک شتێکی زۆر گرنگ دەروانێتە کردەوەی خۆخاڵی کردن. چونکە ئەم کارە بە یەکەمین کردەوەی داهێنەرانەی ئەو دادەنرێ. دیارە زۆر زەحمەتە بزانین مێشکی منداڵێکی یەک یان دووساڵە چی تێدایە بەڵام دڵنیاین زۆر لەو منداڵانەی لە تەمەنی ٧-٨ ساڵی دان، لە پێوەندی لەگەڵ کردەوەی خۆخاڵی کردن‌دا شانازی بە خۆیانەوە دەکەن و هێز و دەسەڵات لە خۆیان‌دا بەدی دەکەن.

ئینسانێکی ئاسایی لە شێر دەسڵەمێتەوە. ترسان لە شێر شتێکی سروشتی‌یە بەڵام ترسان لە مشک ترسێکی سروشتی نیە. ترسان لە شێر نیشاندەری مەترسی‌یەکی راستەقینەیە، بەڵام ترسان لە مشک سەرکوت کرانی سەرنج و ئۆگری دەگەیەنێ. سەبارەت بە منداڵانیش مەسەلەکە هەر بەو شێوەیەیە و لەوانەیە مەیل و داخوازە سەرکوتکراوەکانی ئەوان بە شێوەی ترسێکی شێتانە خۆ بنوێنێ.

بەشی زۆری منداڵان لە تاریکی، شەو، تارمایی، دزی و دیاردەی دیکە دەترسێن. دایک و بابی بێ‌ئاگا پێیان وایە ئەم جۆرە ترسانە لە ئاکامی بیستنی چیرۆکێک یان دیتنی فیلمێکی ترسێنەردا پێک هاتوون. بەڵام چیرۆک یان فیلم تەنیا ئەوەندە شوێن دادەنێن کە ئەو ترس و نیگەرانی‌یانەی لە پێشترەوە لە منداڵ‌دا هەن، دەگوورێنن. یەکێک لە هۆیەکانی ئەو نارەحەتی‌یانە لە رەفتاری نابەجێی دایک و باب بەرامبەر

به ئۆگری و مەیلی جینسیی منداڵەوە، سەرچاوە دەگرێ. منداڵ لەو مەیل و ئۆگرییە تایبەتییەی خۆی کە ناچار دەکرێ سەرکوتی بکا، دەترسێ. ئەو کەسەش کە ترسێکی شێتانەی لە مشک هەیە، لە راستیدا هی ئەو مەیل و عەلاقەیەیە کە پێشتر بە ناچار لە پاڵ خۆیدا سەرکوتی کردوە. کاتێک بابێک بەسەر منداڵەکەیدا دەگوڕێنێ و بە تووڕەیییەوە داوای لێ دەکا بێدەنگ بێ، خۆش بوونی هەڵاّ و قریوە لە روانگەی منداڵەوە، بە باری زەندەق چوون و ترسان لە باوکدا دەگۆڕێ و هەرکات داخوازی منداڵ رەت بکرێتەوە، بوغزاندن و دوژمنایەتی کردن لە دەروونی ئەودا هێلانە دەکا. هەرکات من بە زۆر و زۆرداری بووکە باغەیەک لە دەست منداڵێکی سێ ساڵانەی زیت و وریا دەرێنم، ئەگەر بۆی بلوێ حەز دەکات لەت و پەتم بکا. ئەو راستییە کە منداڵ بوونەوەرێکی خۆخوازە و دنیای تەنیا بۆخۆی دەوێ، قەت نابێ پشت گوێ بخرێ.

لە قوتابخانە رۆژێک لەسەر کورسییەکی ئاسوودە کە پارچەیەکی خەت خەتی رەش و نارنجیی دیوی دەرەوەی داپۆشیبوو، دانیشتبووم، بیلی یەکێک لە قوتابییە کەم تەمەنەکان هاتە لام و داوای لێ کردم چیرۆکێکی بۆ بگێڕمەوە. پێم گوت: ئەی بۆچی تۆ چیرۆکێکم بۆ ناگێڕیەوە؟ گوتی: ئەمن چیروکان نازانم، تۆ دەبێ چیرۆکم بۆ بگێڕیەوە. دیتم کە رێگای دەرباز بوون نیە، هەر بۆیە پێشنیارم پێ کرد کە بە هەردووکمان چیرۆکێک بگێڕینەوە. ئەمن دەست دەکەم بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە و لە هەر جێگایەک راوەستام، دەبێ ئەو پاشماوەی چیرۆکەکە تەواو بکا. دەستم بە چیرۆکەکە کرد و گوتم: هەبوو نەبوو رۆژێک لە رۆژان ...

بیلی چاوێکی لەو کورسییە خەت خەت رەش و نارنجییەی من لەسەری دانیشتبووم کرد و گوتی: «بەورێک هەبوو». دەمزانی منی بەڕێوەبەری قوتابخانە لە روانگەی بیلییەوە لە جێگای ئەو بەورەم.

درێژەم بە چیرۆکەکە دا و گوتم: ئەو بەورە لەکاتی رابردن‌دا لەبەر دەرکی قوتابخانەکەمان راوەستا. راست لەو کاتەدا کوڕێکی قوتابیی قوتابخانەکەمان هاتە بەر دەرکی قوتابخانە کە ناوی ...

بیلی گوتی: «دۆنالد بوو». دۆنالد یەکێک لە خۆشەویستترین دۆستەکانی بوو. من درێژەم دا و گوتم: بەورەکە هەرکە چاوی بە دۆنالد کەوت دەست بە جێ قەلەمبازێکی داو ...

قسەکەم تەواو نەکردبوو کە بیلی گوتی: «دۆنالدی هەڵلووشی». چیرۆکەکەم بەو جۆرە درێژە دا: لە جەنگەی ئەو رووداوەدا براکەی دۆنالد دەگاتە وێ و دەڵێ: ئێستا مشووری ئەو بەورە دەخۆم و دوا بەدوای ئەو قسەیە تفەنگی لێ راست دەکاتەوە کە بەورەکە قەڵەمبازێکی دیکە دەدا و... بیل بە خۆشحاڵی‌یەوە گوتی: «ئەویش هەڵ دەلووشێ». پاشان گوتم: نیل (واتە بۆخۆم) بەڕێوەبەری قوتابخانە تووڕە دەبێ و دەڵێ: نا من رێگا نادەم ئەو بەورە هەموو قوتابی‌یەکانم بخوا. هەردووک تفەنگی خۆی دەست دەداتێ و لە قوتابخانە دێتە دەر کە لە نەکاو بەورەکە هەڵ دەکوتێتە سەری و ... بیلی گوتی: «تۆش هەڵ دەلووشێ». ئەمجار گوتم: لێرەدا بوو کە بیلی تووڕە بوو و دوو رۆلوێر، شمشێرێک، موسەلسەلێک و کێردێکی پڕ دایە و چووە دەرێ کە بەورەکە پەلاماری دا و ... بیلی بێ خۆ رانان گوتی: «بیلی بەورەکە دەکوژێ». گوتم: هەی دەستخۆش و دوایە بەم جۆرە لەسەر چیرۆکەکە رۆیشتم: «بیلی کەلاکی بەورەکە رادەکێشێ بۆ نێو حەساری قوتابخانە تا هەموان لە نزیکەوە ببینن. لەو کاتەدا یەکێک لە مامۆستاکان دەڵێ ئێستا کە سەرۆکی قوتابخانەکەمان ئەو بەورە خواردوویەتی، پێویستە سەرۆکێکی دیکە هەڵ بژێرین. بۆیە من پێشنیار دەکەم کە ... »

چاوی بڕی‌یە بەرپێی و بێدەنگ بوو.

قسەکەی پێشوورم دووپات کردەوە: «بۆیە پێشنیار دەکەم کە... » بە

جۆرێک رەنگ گۆڕانەوە گوتی: «بۆخۆت چاک دەزانی کە من وەک سەرۆکی قوتابخانە پێشنیار دەکەن».

درێژەم بە چیرۆکەکەدا و گوتم: «بەم جۆرە بیلی بوو بە سەرۆکی قوتابخانە. بەڵام بیلی ئێستا دەبێ چ بکا؟.

بیلی دوور لە هەرچەشنە دوو دڵی و نیگەرانی‌یەک گوتی: «ئەمن دەبێ بچم لە پشت مێزەکەی تۆ دانیشم و لە تایپەکەت کەڵک وەربگرم و ... »

هەموو منداڵێک پێی خۆشە لەگەڵ گەوران چۆن رەفتار دەکرێ، لەگەڵ ویش هەر بەم شێوەیە بجووڵێنەوە. هەموو دیاردە و بوونەوەرەکانی دەوروبەری پێی دەڵێن جارێ ئەو هێشتا چکۆڵەیە هەر بۆیە لە خەیاڵاتی خۆیدا نوقم دەبێ و لە جیهانی خەیاڵدا دەفڕێ. یەکێک لە بەرزە فڕی‌یەکانی کوڕە چکۆڵەکان ئەوەیە کە دەیانەوێ ببن بە شۆفێری کامیۆن و شەمەندەفەر یان فڕۆکەوان. هۆیەکەشی ئەوەیە پێ‌یان وایە لەو رێگایەوە دەتوانن هێز و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنن. بزوێنەری هەست و مەیلی دەسەڵاتخوازی لە کچان و کوڕاندا بەیەک رادە هەیە. بەڵام کچەکان زیاتر ئەوەیان پێ خۆشە کە کەسانی دیکە لە ژێر فەرمانیان دابن و فەرمانڕەوایی‌یان بەسەردابکەن، لە حاڵێکدا کوڕەکان حەز دەکەن لە رێگای بەکار هێنانی ئامراز و کەل و پەلی دیکەوە دەسەڵات و توانای خۆیان بسەلمێنن.

ئاواتی کوڕە چکۆڵەکان هەمیشە ئەوەیە کە وەک باوکیان بەهێز و گەورە بن و کچەکانیش لاسایی کردنەوەی دایکیان پێ خۆشە. هەربۆیەشە کە کوڕان یاری بە کەل و پەلی ریش تاشینی باوکیان دەکەن و کچانیش بە خۆشحاڵی‌یەوە کەوشی دایکیان دەکەنە پێ. ئەوەش کە منداڵان سەریان لە سیگارکێشان دەخورێ تەنیا و تەنیا لەو راستی‌یە واتە هەست کردن بە گەورەیی و گەورە بوونەوە سەرچاوە دەگرێ. خۆزیای گەورە بوون و هەست

کردن بە بوونی هێز و دەسەڵات یارمەتیی منداڵان دەدا تا بەرەو پێشەوە مل بنێن و بنیاتی کۆشکی داهاتووی خۆیان دارێژن.

## ئێرەیی (حەسوودی)

ئێرەیی تێکەڵاویکە لە خۆشەویستی و بە هی خۆ زانینی کەسێک یان شتێک کە دڵ گرتوویەتی. دژ کردەوەی ئەو کەسەی ئێرەیی دەبا دەگەڕێتەوە بۆ سووکایەتی کران بە «من»ی ئەو. ئەو لەوە دەترسێ ئەو کەسە یان ئەو شتەی بە لایەوە خۆشەویستە لە دەستی دەربچێ.

حەسوودیی منداڵان لە نێو بنەماڵەدا پێوەندیی بە هەڵس و کەوتی دایک و باب و ڕەفتاری منداڵی گەورەی ماڵەوە هەیە. ئەگەر منداڵی گەورەی ماڵێ وەک منداڵێکی سەربەخۆ ڕاهێنرابێ و وەخت و ناوەخت لە ئامێزی دایکیدا نەبووبێ، وێ ناچێ ئێرەیی بە خوشک و برای لە خۆی بچووکتری بەرێ. دایک و باب دەبێ لەو ئاکار و کردەوانە کە دەبنە هۆی ئێرەیی بردنی منداڵە گەورەکان، بۆ وێنە پێ هەڵگوتنی ساوا تازە لە دایک بووەکەیان، خۆ بپوێرن . منداڵان لە هەر تەمەنێک دابن مانای دادپەروەری یان باشتر بڵێین مانای بێعەداڵەتی تێ دەگەن. دایک و بابی تێگەیشتوو زۆر وشیاری ئەوەن کە نەکا بە هۆی ڕاگەیشتن بە منداڵە بچووکەکەیان هەستی ئێرەیی لە منداڵە گەورەکەیاندا بهاروورژێنن. وێ دەچێ ئەوە کارێکی ئەوەندەش هاسان نەبێ و زۆر جاران لە کردن نایە.

لە ڕوانگەی براگەورەوە شیرخواردنی خوشک یان برا ساواکەی لە مەمکی دایکی، غەدرێکە کە لەوی دەکرێ. بەڵام هەر ئەو براگەورەیە، ئەگەر بە شێوەیەکی سەربەخۆ ڕاهێنرابێ و بە منداڵی، ئەویش تێر بە دڵی خۆی شیری لەو مەمکانە خواردبێ، لەوانەیە شیرخواردنی خوشک یان برا ساواکەی لە مەمکی دایکی وەک جۆرە بێ عەداڵەتی‌یەک دەرحەق بە خۆی چاو لێ نەکا. لە هەر حاڵدا گەیشتن بە ئاکامێکی ڕوون و دیار لەو

پێوەندی‌یەدا کارێکی بە زەحمەتە، چونکە ئێمە بەو رادەیە کە پێویستە لەو بارەیەوە لە حەقیقەت ئاگادار نیین. من بۆ خۆم تا ئێستا لێکۆڵینەوەم لەسەر دژ کردەوەکانی منداڵێکی سەربەخۆ لە بەرامبەر خوشک یان برا ساواکەی‌دا نەکردوە و نازانم ئایا ئیرەیی بردن هەر لە جێ‌دا تایبەتمەندی‌یەکی هەمیشەیی سروشتی ئینسانی‌یە یان نا؟

ئەگەر زەینتان دابێتێ، ئەوانەی تەمەنێکیان لێ رابردوە، هەمیشە کە بیرەوەریی چاخی منداڵیی خۆیان دەگێڕنەوە، زۆرتر بیرەوەریی ئەو رووداوانە دەگێڕنەوە کە پێ‌یان وایە جۆرێک بێ‌عەداڵەتی لە دژی ئەوانیان بەدواوە بووە یان بورن بە هۆی ئەوە ئەوان لە جیاتی خوشک و برای لە خۆیان چووکتریان تەمبێ بکرێن. ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە کاکڵەی بیرەوەری گێڕانەوەکەیان ئەوەیە کە «ئەوە من بووم کە هەمیشە دەکەوتمە داو» و لەوە بەگلەیین کە دژکردەوەی هەمیشەیی دایک لە بەرانبەر گریانی منداڵی بچووکی‌دا، سەرکۆنە کردنی منداڵی گەورەیە. ئاشکرایە منداڵی گەورەتر زیاتر دەکەوێتە بەر بەرهەڵست و دژایەتی لەگەڵ کران. منداڵی چکۆلەی ماڵێ لەبەر ئەوەی کەمتر تامی تاقانە بوون و گوڵەجەرگەبوونی تاقی کردۆتەوە، زۆر بە کەمی هەست بە بێ‌عەداڵەتی دەکا. هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەوانەی منداڵی گەورەی بنەماڵەن زیاتر لە منداڵانی دیکە لەگەڵ ئاڵۆزی و گیروگرفتی دەروونی بەرەورروو دەبن. زۆر جاران دایک و بابەکان بێ ئەوەی نیازی ئازاردانی کچ یان کوڕە گەورەی ماڵی‌یان هەبێ، تایبەتمەندی‌یە باشەکانی خوشک یان برای بچووکتر لەوان بە چاوی ئەوان دادەدەنەوە و بەم جۆرە دەبنە هۆی رەنجاندن و بە رقەدا بردنی ئەوان. بۆ وێنە کاتێک دایک بە منداڵە گەورەکەی دەڵێ: ئەگەر برا چکۆلەکەت دەستی خۆی بڕیبا ئەوەندە نەدەگریا، یان بڕوانە خوشکە چکۆلەکەت چەند جوان لەگەڵ دەرسەکانی خۆی خەریکە و ... هەستی ئیرەیی بردن بە خوشک یان برای بچووک بە شێوەیەکی نەخوازراو لە

منداڵە گەورەكەی‌دا دەهاروروژێنێ.

مەسەلەیەكی دیكە كە هەستی ئیرەیی بردن لە منداڵاندا دەبزوێنێ و دەبێ دووریی لێ بكرێ، فەرق و جیاوازی دانان لە نێو ئەوان لە بواری خواردن و خواردەمەنی دایە. ئەگەر منداڵێك چی پێی خۆش بوو بۆی ساز كرا و بەڵام گوێ نەدرایە داوا و ئیشتیای ئەوانی دی، لێرەش‌دا لەوانەیە بە شێوەیەكی نەخوازراو هەستی ئیرەیی بردن لە منداڵان‌دا بهاروروژێندرێ. ئەگەر چێشت بە دڵی منداڵان لێ دەنرێ، واباشە هەر جارەی پێشنیاری یەكێك لەوان وەبەرچاو بگیرێ تا هیچیان ئیرەیی بە وانی دیكە نەبەن.

رۆژێك یەكێك لە قوتابیانی قوتابخانە نامەیەكی لە باوكیەوە بۆ هاتبوو. شەوی دوای ئەو رۆژە، لای نیوەشەوێ، لە ژووری نووستنی ئەو قوتابی‌یە، دەنگی هاوارێك بەرز بۆوە، بە پەلە خۆم گەیاندە ژوورەكەی، خەریكی خنكاندنی پشیلەیەك بوو. پشیلەكەم لە دەستانی دەرباز كرد. بۆ بەیانی لەسەر تەختی خەوتنی چاوم بەو نامەیە كەوت كە لە باوكیەوە بۆی هاتبوو. لە نامەكەدا نووسرابوو: « دوێنێ بە بۆنەی ساڵرۆژی لە دایك بوونی براچكۆلەكەت جێژنمان گرتبوو و پشیلەیەكی بچووكمان وەك دیاری پێ‌دا، زۆر خۆشمان رابوارد و ...». دایك و باب دەبێ بزانن كە منداڵان لە بیر و خەیاڵی خۆیان‌دا هەموو جۆرە رەقیبێكی خۆیان لە نێو دەبەن. هەربۆیە دەبێ ئەوەندەی بكرێ لە جووڵاندن و هاروروژاندنی هەستی ئیرەیی بردنیان، دووری بكرێ. منداڵی یەكەمی ماڵێ هەمیشە پێی وایە كە دایكی تەنیا بەو خوشك یان برایە تازە لە دایك بووە، رادەگا و ئەوی بە تەواوی لە بیر خۆی بردۆتەوە. بۆیە رق و قین لە دڵی خۆی‌دا رادەگرێ و ئەو رق و قینە حەشار دراوەی نێو دەروونیش، زۆر جاران ئەگەر دایك رێگای لاواندنەوەی منداڵە بە رق داچووەكەی بگرێتە بەر و لە نیشان‌دانی خۆشەویستیی خۆی‌دا زیدە رۆیی بكا، كۆتایی پێ دێ.

هێندێک جار ، دایک و بابەکانیش ئیرەیی بەو مامۆستایانە دەبەن کە خۆشەویستی منداڵەکانیانن. ئەگەر توند و تیژی و ڕێ و شوێنی وشک و سەخت بەسەر فەزای بنەماڵەدا زاڵ بێ، سروشتی‌یە کە منداڵانی ئەو جۆرە بنەماڵانە هەر کە ڕێیان بکەوێتە قوتابخانەی ئازاد و خاوەن مامۆستای تێگەیشتوو، ئۆگری مامۆستایانیان دەبن. لە قوتابخانەی ئێمەدا زۆرجار ڕێ دەکەوێ کە قوتابیان بۆ تێپەر کردنی ڕۆژانی پشوودانیش ناچنەوە ماڵی خۆیان. ئەو قوتابی‌یانە ئەوانەن کە بڕیار و ڕێ و شوێنی زۆر وشک و سەخت بەسەر بنەماڵەکانیاندا زاڵە. بەڵام بە پێچەوانە، ئەو منداڵانەی لە نێو بنەماڵەکانیاندا هەست بە سەربەستی دەکەن، شاد و خۆشحاڵ دەگەڕێنەوە ماڵێ.

لە نێوان دایک و بابان و ڕاهێنەراندا نابێ ڕقەبەرایەتی هەبێ. ئەگەر دایک و باب بە گرتنە پێشی ڕەفتاری وشک و،نەزم و ڕێ و شوێنی سەرەڕۆیانە لە جیاتی ڕاکێشانی خۆشەویستی و ئۆگری منداڵانیان بۆلای خۆیان، ئەوان بەرەو قین لە زگی و بوغزاوی بوون پاڵ پێوە دەنێن، دەبێ ئەو چارەروانی‌یەشیان هەبێ کە منداڵانیان ئەو ئۆگری و خۆشەویستی‌یە لە جێیەکی دیکەدا بدۆزنەوە. مامۆستا، یان ڕاهێنەر لەراستی‌دا لە جێی دایک و بابە و ئەو ئۆگری و خۆشەویستی‌یەی لە ماڵێدا کەسپی لە پێشە، بۆ لای ئەو ڕادەکێشێن.

جاری وایە بابی وا دەبینین کە ئیرەیی بە کوڕەکەی دەبا. ئەو جۆرە پیاوانە دەیانەوێ هەر بۆ خۆیان بەشیان بە ئۆگری و خۆشەویستیی هاوسەرانیانەوە هەبێ و لەراستی‌دا کوڕەکانیان بە ڕەقیبی خۆیان دەزانن. هەر لەسەر ئەوەشە کە زۆر جار کوڕەکانیان بە توندی تەمبێ دەکەن. بابەکان دەبێ بزانن کە زیاد بوونی ساوایەک لە ئەندامانی بنەماڵەکەیان هێندێک جار دەبێتە هۆی پێک هاتنی جۆرێک ئاڵۆزی لە نێو بنەماڵەکەیاندا و ڕەنگە وا هەست بکەن کە ئەوان لە ماڵێدا شتێکی

زیادین. هیندێک لە ژنانیش پاش مندالْ بوون، لەباری پێوەندیی جینسیی‌یەوە بیٚ مەیل دەبن و سەرەنجام خۆشەویستیی کورپەی ساوا وەزعێکی وا پێک دێنیٚ کە پێوەندی‌یەکی تازە بەسەر بنەماڵەدا زالْ بیٚ. کەوابوو ئێوەی دایک، یان باوک دەبیٚ بەو مەسەلانە بزانن ئەگینا ئێرەیی بە منداڵی خۆتان دەبەن. ئێمە لە قوتابخانە تائێستا دەیان منداڵمان دیوە کە لە بەرچاوتەنگی و ئێرەیی بردنی دایک یان باوکیان بەوان، زاڵەیان هاتوە. کردەوە و هەڵس و کەوتی ئەو بابانەی ئێرەیی بە کورپەکانیان دەبەن و بە توندی لەگەڵیان دەبزوونەوە، زیاتر لە چاو دەدا. ئەگەر بابێک بە مەبەستی راکێشانی ئۆگری و خۆشەویستیی دایک، لەگەلْ منداڵەکەی بکەوێتە رەقەبەری، دەبیٚ دڵنیابیٚ کە منداڵەکانی کەم یان زۆر تووشی ئالۆزی‌یە رووحی‌یەکان دەبن.

هێندێک دایک کە رەنگ و رووی لاوەتی‌یان پێوە نامێنیٚ، ئێرەیی بە کچە گەنجەکانیان دەبەن کە لە حاڵی پشکووتنی رووحی و جیسمی دان. ئەوانە ئەو دایکانەن کە هەمیشە بە خۆ هەڵکێشانەوە یادی رابردووی خۆیان دەکەنەوە.

کەوابوو ئێمە دایک و بابەکان بێجگە لەوەی دەبیٚ لە هارووژاندنی هەستی ئێرەیی بردن لە منداڵانماندا خۆ بپارێزین، پێویستە خۆشمان ئێرەیی بەوان و لاوەتیی ئەوان نەبەین.

## نیگەرانیی دایک و بابەکان

دایک و بابی نیگەران ئەوانەن کە ناتوانن رێز و خۆشەویستی و ئازادی‌و دڵنیایی بدەن بە منداڵەکانیان.

رۆژێک یەکێک لە قوتابیانی تازەی قوتابخانەکەمان بۆ تێپەر کردنی پشووی کۆتایی حەوتوو، چووبۆوە لای دایکی. لەو دوو رۆژەدا کە لە مالیٚ لە لای دایکی مابۆوە، دایکی ئەوەندە دڵەخورپە و نیگەرانیی لە

خۆی نیشان دابوو، کە ژیانی بە تەواوی لێ تاڵ کردبوو. تەنانەت کاتێک برسییش نەببوو، دایکی کەوتبووە دووی و زۆرییی لێ کردبوو کە شتێک بخوا. یان کاتێک ویستبووی لە نێو باغ یاری بکا، دایکی بەو بیانووە کە جلەکانی پیس دەبن پێشی پێ گرتبوو و ناچاری کردبوو حەمام بکا و خۆی پاک و خاوێن رابگرێ. ئەومنداڵە چووبوو بە پووڵی گیرفانی خۆی بەستەنی (ئایسکرێم)ی کڕیبوو و دایکی سەبارەت بە زیانەکانی ئەم کارە سەعاتێک قسەی بۆ کردبوو. هەموو جارێ کە ناوی منی هێنابوو و بەر لە ناوەکەم وشەی ئاغای بەکار نەهێنابوو، دایکی بەسەری ڕۆیشتبوو و پێی گوتبوو کە بێ بەکار هێنانی وشەی «ئاغای» نابێ ناوم بێنێ.

ئەو دایکە سەرەنجام ڕۆژێک ڕێی کەوتە قوتابخانەکەمان. لێم پرسی: تۆ کە ئەوەندە ڕاراو نیگەرانی و دەتەوێ منداڵەکەت لەگەڵ نەزم و ڕێک و پێکی رابێ، بۆچی ناردووتە قوتابخانەی ئێمە کە لە سەر بنەرەتی ئازادیی منداڵ، دامەزراوە؟ بەسەر سوڕمانەوە گوتی: چونکە دەمەوێ ئینسانێکی ئازاد و بەختیار بێ. دەمەوێ ئینسانێکی سەربەخۆ بێ و رووهەڵماڵاو فێر نەبێ.

لێرەدا بوو کە ئەمن هەناسەیەکم هەڵکێشا و سیغارێکم داگیرساند. ئەو خانمە هەر لە جێدا نەیدەزانی کە بەم جۆرە دەبێتە کۆسپی سەربەخۆبوونی منداڵەکەی و بێ ئەوەی بۆ خۆی بیەوێ هەموو دڵەخورپە و نیگەرانییەکانی دەداتە منداڵەکەشی.

کاتێک کار بگاتە ئێرە چمان بۆ دەکرێ؟ هیچ! ئەوەندە نەبێ کە هیوادار بین لە نێو بە میلیون دایک و بابدا، هێندێکیان تێبگەن کە لە هەڵەدان. کاتێک دایکێک نامەم بۆ دەنووسی و لێم دەپرسێ «کوڕە دوازدە ساڵەکەم فێر بووە دزی لە دوکانەکان دەکا، چارەم چییە؟» وەک ئەوەم دێتە بەرچاو کە کابرایەکی ئارەقخۆر پاشی بیست ساڵ ئارەقخۆری

و دوای ئەوەی جـــەرگی بە تەواوی خـراپ بووە بیَ لیَم بپـرسیَ: چارەم چی‌یە؟ بیَگومـان لەو وەزعەدا کە ئەو تووشی هاتوە، ئەگەر پیَی بلَیَم واز لە خــواردنەوەی ئارەق بیَنیَ، یارمـــەتی‌یەکی ئەوتۆم نەداوە. چونکە لەراســتی‌دا تازە جــەرگی وی خــراپ بووە و بۆ هەر چەشنە یارمـــەتی دانیَک، درەنگ بووە. هەر بۆیە کـاتیَک دایکیَک زۆر بە نیگەرانی‌یەوە نامەم بۆ دەنووسیَ و سەبارەت بە گیروگرفتیَکی گرنگی خۆی لەگەلْ منداڵەکەی، پرسم پیَ دەکـا: رای دەسـپیَرم کـە منداڵەکـەی بەریَتـە لای دەروونناس (روانشناس) و داوای یارمەتیی لەو بکا.

دیارە دەتوانم لە وەلاَمی‌دا بلَیَم: دایە گیان ئەگەر کوڕەکەتان دەستی کردوە بە دزی کردن و یان گیروگرفتی دیکەی بۆ پیَک هاتوە، هی ئەوەیە کە لە مـالیَ‌دا هەست بە بەختیـاری ناکا. بۆچی هەولْ نادەن ئالْ و گۆڕ لە بنەمـاڵە و پیَوەندی‌یەکـانی‌دا پیَک بیَنن؟ بەلاَم بە نـووسـینی ئەو جـۆرە شـتـانە ئەو دایـکە تەنیـا هەسـت بە نارەحـەتیی ویژدان دەکـا و ئەگەر بە راسـتـیـش بی‌هەویَ ئالْ و گۆڕ بەسەر پیَوەندی‌یەکانی نیَو بنەمـاڵەکـەیان دابیَنیَ، بۆی ناکریَ. بەلاَم لەوانەیە دەروونناس پاش ماوەیەکی زۆر قسـە و باس لەگەلْ ناوبراو و ئاگا بوون لە پیَوەندی‌یەکـانی نیَو بنەمـاڵەکـەیان پیَشنیـاری پیَ بکا کە لە میَردەکەی جویَ بیَتـەوە چونکە ئیَسـتـا ئیدی ئەوی خۆش ناویَ ، یان پیَی بلَیَ داوا لە خەسووەکەت بکە کە چی‌دیکە خـۆ لە ژیانی ژن و مـیَردایەتیی ئیَوە هەلْنەقـوتیَنیَ. بەلاَم دەروونناس ناتوانیَ سروشتی دەروونیی ئەو ژنە کە نیگەران و سام‌گرتوویە بگۆڕیَ. گۆڕینی هەل و مەرجی دەرەوە چاری هەموو گیروگرفتەکان ناکا. زۆر لە کـردەوەکـانی ئیَمـە رەگ و ریشـەیان لە سـەرنەکـەوتـن و ناکـامی‌یەکـانی رابردوومـان دایە و شـویَنەواری ئەو ناهومـیَدی‌یانە بیَ ئەوەی دەسـەلاَتی ئیَمەی تیَ‌دابیَ دژکردەوە لە خۆی نیشان دەدا. کەوابوو ئەگەر ئالْ و گۆڕ تەنیـا لە هەل و مـەرجی دەرەوەدا پیَک بیَ، بە رادەیەکی زۆر کـەم لە

چارەسەر کردنی گیروگرفتەکان‌دا نەخشی دەبێ.

وەبیرم دێ دایکێک هاتبووە قوتابخانەکەمان تا کچە ٧ ساڵانەکەی ناونووس بکا. ناوبراو هەر کە لە قوتابخانە وەژوور کەوت، هێندێک پرسیاری کردن کە نیشاندەری دڵەراوکێ و نیگەرانیی ئەو بوون. ئەو لێکدا لێکدا دەی‌پرسی: دەتوانن دڵنیام بکەن کە کچەکەم هەموو شەو و بەیانی‌یەک دەدانەکانی دەشوا؟ کاتێک لە شەقام دەپەڕێتەوە هیچ کام لە ئێوە لەگەڵی‌دا دەبن؟ داخوا هەموو ڕۆژێ لە ژووری دەرس خوێندن‌دا ئامادە دەبێ؟ بڵێی هەموو ڕۆژێ دەوا و دەرمانەکانی لە کاتی خۆی‌دا بخوا؟ یەکێکی دیکە لەو جۆرە دایکانە کە بەردەوام نیگەرانی ساخ و سەلامەتیی کچەکەی بوو، هەموو ڕۆژێ نامەی لێ دەنووسیم تا وەبیرم بێنێتەوە کە کچەکەی چ خواردنێک بخوا و لە چ خواردنێک دووری بکا، یان چۆن جل و بەرگێک بکاتە بەری و هتد. بەداخەوە دایک و بابەکان ئەم جۆرە نیگەرانی و دڵەراوکی‌یانە تووشی منداڵەکانیشیان دەکەن و ئاکامەکەی ئەوەیە کە ئەم ڕۆژانە بڕوانیە هەر جێ‌یەک زۆر و زەوەند مرۆڤی ماخولیا و نیگەرانت بەرچاو دەکەوێ.

«مارتا» قوتابیی قوتابخانەکەی ئێمە، برایەکی چکۆڵەی هەبوو. دایک و بابی لەو دایک و بابە نیگەران و دوو دڵانە بوون. هەر بۆیە مارتا لە قوتابخانە هەمیشە بە شوێن برا چکۆڵەکەیەوە بوو و بەردەوام هەرای لێ دەکرد: «نەچیە نێو ئاوێ، لاقت تەڕ دەبن»، «یاریی بە خۆڵ و قوڕ نەکەی، جل و بەرگەکەت پیس دەبێ» و بە کورتی ساتێک نەبوو، نیگەرانی براکەی نەبێ. ئەو نیگەرانی و دوودڵی‌یەی لە دایک و بابی وەرگرتبوو. بەڵام پاش ماوەیەک مانەوە و ئاشنا بوون لەگەڵ ژینگەیەکی ئازاد، ئیدی بۆی گرنگ نەبوو کە براکەی یاریی بە خۆڵێ دەکا. پێی باشتر بوو براکەی دەم و چاوێکی ناخاوێن بەڵام گەش و خۆشحالی هەبێ.

زۆر جاران وابیر دەکەمەوە کە ناوبانگ و خۆشەویستیی قوتابخانە

سەختگرەکان هی ئەوەیە کە قوتابیانی ئەو جۆرە قوتابخانانە کاتێک قوتابخانەکەیان دادەخرێ و دەچنەوە ماڵێ، هەست بە خۆشی دەکەن و دایک و بابیان وا بیردەکەنەوە ئەو خۆشی‌یە لە ئۆگریی ئەوان بە بنەماڵەوە سەرچاوە دەگرێ. کەچی ئەوان ئەوەندە لە نەزم و رێ و شوێنە وشکەکانی قوتابخانە وەڕەزن کە لەراستی‌دا، بوون لە نێو بنەماڵەدا تام وچێژیان پێ دەبەخشێ.

زۆرجار دەبینم کە دایک و بابەکان دەڵێن: ئەمن منداڵەکەم دەنێرمە فیسارە قوتابخانەی بەناوبانگ تا لەگەڵ منداڵی ئەوتۆ ئاشنا ببێ کە لەداهاتوودا بتوانن یارمەتیی بدەن. ئەوان وابیردەکەنەوە کە هەموو نسلەکان وەک یەک دەروانن بایەخە کۆمەڵایەتی‌یەکان. ئیدی لەوە حاڵی نین کە هەر نەسلێکی تازە، بایەخی تازەش لەگەڵ خۆی‌دا دێنێ. نیگەرانی لە داهاتوو لە زۆر لە دایک و بابەکان‌دا بە قووڵی ریشەی داکوتاوە و بەو هاسانی‌یەش ناکرێ خاشەبڕی بکەین.

ئەو دایک و بابانەی قوتابخانە سەختگرەکانیان پێ باشترە، زۆرتر ئەوانەن کە بۆخۆیان ملهوڕ و زۆردارن. ئەم جۆرە قوتابخانانە ژیانی عاتیفی و داهێنەرانەی منداڵ بەرتەسک دەکەنەوە و دەی‌کەن بە مرۆڤێکی گۆشەگیر و ترسنۆک و سەرەشکێنە کراو. ئامانجی ئەو قوتابخانانە ئەوەیە کە منداڵان بە جۆرێک رابێنن کە لە بەرامبەر هەر ئەمردەر و سەرۆک و دیکتاتۆرێک‌دا کە لە ژیان‌دا لەگەڵی بەرەوروو دەبن، گوێ رایەڵ بن و دەستە و نەزەر راوەستن. ئەو ترسەی ساوایەک لە لانکێ‌دا لەگەڵی ئاشنا دەبێ لەو جۆرە قوتابخانانەدا لە ئاکامی توند و تیژیی مامۆستا سەختگرەکان‌دا (کە رەفتار و نەزمی توند و وشکیان لە غەریزەی پرکێشیکەری ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێ) پەرە دەستێنێ. بەرپرسانی قوتابخانە سەختگرەکان دەیانەوێ بۆ ئەنجامدانی هەر کارێک دەسەڵاتی تەواویان هەبێ. دایک و بابە ترسەنۆکەکانیش بە تەواوی لەو

وەزعە رازی و خوشحاڵن. «من»ی هەر فێرکار و مامۆستایەکی تینووی دەسەڵات وەک «من»ی هەرکەسێکی دیکەی تامەزرۆی دەسەڵات لە هەوڵ دایە لەسەر قوتابیان شوێن دابنێ. مامۆستایەکی ئەوتۆ خۆی بە خوای کلاسەکەی دەزانێ. ئەو حەز دەکا فەرمانان بدا و هەموانیش گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی بن. پێی خۆشە قسە لە قسەی‌دا نەکرێ و قسەی ڕەسەرقسەی هەموان بکەوێ. لە قوتابخانەیەکی ئازاددا توخم (عنصر)ی دەسەڵات، وەلا دەنرێ. لە قوتابخانەی ئێمە، مەترسیی ئەوە کە «من»ی مامۆستا بتوانێ مەیدانداری بکا، بەدی ناکرێ. منداڵان لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ من بە شێوەیەکی ڕەسمی قسان بکەن، هەر بەو جۆرە دەدوێن کە لەگەڵ کەسانی دیکە دەدوێن و هەر بەو جۆرە ناوی من دێنن کە ناوی دۆستانی خۆیان دەبەن. ئەوان زۆر جاران پێم دەڵێن «حۆلە» و «گێژە» (ئەوانەش ئەو وشانەن کە منداڵان بۆ یەکێکی خۆشیان بوێ بەکاری دێنن). لە قوتابخانەیەکی ئازاددا، ڕێز و خۆشەویستی لە هەموو شتێک زیاتر گرنگیی پێ دەدرێ و ئەو وشانەی بۆ دەربڕینی ئەو ڕێز و خۆشەویستی‌یە کەلکیان لێ وەردەگیرێ، لە پلەی دووهەمی گرنگی دان.

مامۆستایان و ڕاهێنەرانیش وەک ئینسانەکانی دیکە، خاڵی لاوازی تایبەت بە خۆیانیان هەیە. زۆر لەوان کە بۆخۆیان منداڵیان نیە، بێ ئەوەی بە دەست خۆیان بێ قوتابی‌یەکانیان وەک جگەرگۆشەی خۆیان چاو لێ دەکەن و خۆیان بەسەرپەرستی ئەوان دەزانن. واباشە هەر مامۆستایەک لەگەڵ دەروونناسێکی بواری فێرکردن هاوکاری و ڕاوێژی هەبێ و گیروگرفتەکانی خۆی لەگەڵ باس بکا تا باشتر لە کەسانی دیکە تێ بگا. مامۆستایەک کە لەگەڵ دەروونناس‌دا هاوهەنگاریی هەیە، هاسانتر لە خەڵکی دیکە حاڵی دەبێ و باشتر لە گیروگرفتەکانیان دەگا. لە مانەش زیاتر، مامۆستایەک کە لەگەڵ دەروونناس هاوکاری و پێوەندیی هەیە، بۆ قبووڵ کردنی ڕەخنەش ئامادەیی زیاترە و هەوڵ دەدا لە ڕێگای ناسینی

خاڵە لاوازەکانی خۆیەوە، بۆ لە نێو بردنیان تێبکۆشێ.

ئەگەر بنەماڵەیەک لە بەندی کێشە و بێنە و بەرە و ترس و نیگەرانییەکانیدا، خۆی زیندانی بکا، بە ئاکامێکی زۆر خراپ دەگا. منداڵێک کە دایک و باوکێکی نیگەران و ئالۆز و زیدەخوازی هەن، زۆر زوو دەبێ بە ئینسانێکی قین لەسک و رقاوی، چونکە بێ ئەوەی بۆخۆی ئیرادەی کردبێ، هەوڵ دەدا نەکەوێتە ژێر شوێنەواری ئەوان. ئەو منداڵەی دوور لە نیگەرانی و کێشە و بێنە وبەرە، پەروەردە دەکرێ، بە گیانێکی نەترسانە و کۆن‌پشکنانە بەرەورووی ژیان دەبێتەوە و بەسەر کەند و کۆسپەکانی دا زاڵ دەبێ.

## ناسرانی منداڵان لە لایەن دایک و بابەکانیانەوە

بۆ ناسینی راستەقینەی هەر کەسێک، نابێ هەر بە ناسینی رواڵەتیی ئەو واز بێنین و پێویستە هەموو تایبەتمەندییەکانی ئەومان بە تەواوی بۆ دەربکەوێ. دایک و بابەکان لەبەر بەستراوەیی عاتیفییان بە منداڵانیان، گیروگرفتە بنچینەیییەکانی ئەوانیان بە هاسانی بۆ روون نابێتەوە. بەڵام دەروونناس و راهێنەر چونکە لەباری عاتیفییەوە، ئەوەندە ئۆگری نەخۆش یان قوتابیان نین، گیروگرفتەکانی ئەوانیان باشتر بۆ لێک جوێ دەکرێتەوە. ئەمن کاتێک دەگەمە ئەو ئاکامە کە گیروگرفتی قوتابییەک لە ناکۆکی و نێوان ناخۆشیی دایک و بابیەوە سەرچاوە دەگرێ، ناچار دەبم بە دایک و بابێ بڵێم تا ئێوە لە پێش‌دا رەفتاری خۆتان نەگۆڕن، گیروگرفتی منداڵەکەتان چارەسەر نابێ.

ئەگەر ژن و مێرد لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا ناکۆکیی زۆریان لە نێودا هەبێ، ئەو وەزعە شوێن لەسەر منداڵەکەیان دادەنێ. تەنانەت ئەگەر ئەوان هەموو هەوڵی خۆشیان بۆ شاردنەوەی ئەو ناکۆکییانە لە منداڵەکەیان، بەکاربێنن، دیسان منداڵ هەستی پێ دەکا و بە جۆرێکی

ەیکە دژکردەوە لە خۆی نیشان دەدا. یەکێک لە قوتابیانی قوتابخانەی ئێمە کە هەموو کاتی خۆی لەوێ دەباتە سەر و تەنیا بۆ پشووی هاوینان دەچێتەوە لای دایک و بابی، هەموو جارێ کە لە لای وان ڕا دەگەڕێتەوە، ناجسن و شەڕانی دەبێ، دەرگای ژوورەکان بە توندی پێوە دەدا، بیانووان بە ژوورەکەی دەگرێ و هەمیشە تووڕەیە و کەسانی دیکە ئازار دەدا. چونکە ئەو ماوەیەی لە ماڵێ بووە ئاگای لە دم بە دمە و قسە لێک هەڵبەزینەوەی دایک و بابی بووە. ئەو مەسەلەیە لەسەر هەڵس و کەوت و ڕەفتاری وی لە شوێنی دیکەشدا (وەک قوتابخانە) شوێنی داناوە، لە ئاکامدا وەک ئینسانێکی سەربزێو و نەحاواوە دەجووڵێتەوە. هەربۆیە ئێمە ناچارین یەک دوو مانگان ئەوەی لێ قبووڵ بکەین تا دیمەنەکانی کێشە و دم بە دمەی دایک و بابی لە بیر دەچێتەوە و سەر لە نوێ دەبێتەوە بە قوتابییەکی هاوکێش و گونجاو لەگەڵ کۆمەڵ.

یەکێکی دیکە لە قوتابیانی قوتابخانەکەمان ئەو گیروگرفتەی هەبوو کە شەوانە لەنێو جێ و بانەکەیدا لە خۆی دەمیزت. بەر لەوەی بێتە قوتابخانە، دایکی بۆ ئەوەی واز لەو کارە بێنێ بەڵێنی دابوویە هەر شەوێکی لە خۆی نەمیزێ، خەڵاتی بداتێ. کاتێک هاتە قوتابخانەکەمان، ئەمن پێشنیارێکی پێچەوانەی بەڵێنەکەی دایکیم لەگەڵ هێنایە گۆڕێ و گوتم، هەر شەوێک نوێنەکەت تەڕ کەی، خەڵاتت دەدەمێ. دیارە بەر لە هێنانە گۆڕی ئەو پێشنیارە، بۆ ئەوەی جیاوازیی نێوان پێشنیارەکەی من و بەڵێنەکەی دایکی، مێشکی ئەو تووشی کێشە و بێنە و بەرە نەکا، دایکیم ڕازی کرد بە کوڕەکەی بڵێ ئەو کارەی ئەو بە مەبەستی میز بە خۆدانەکردنی کوڕەکەی کردوویەتی، هەڵە بووە. بۆیەش ئەو کارەم کرد چونکە دەمزانی یەکێک لەو هاندەرانەی ئەو کوڕەی تووشی دەمار ئاڵۆزیی (اختلال عصبی) کردوە، لە دایک بوونی براچکۆلەکەی و ئیرەیی بردن بەو بووە. ئەو وای بیر دەکردەوە کە هۆی خۆشەویست بوونی ساوای ماڵێ

لە لای دایکی، میز بە خۆ داکرن و تەڕ کردنی جێ و بانیەتی. هەر بۆیە دەیەویست بە هۆی لە پاڵ خۆمیزتن خۆی ساوا بکاتەوە و بەم جۆرە خۆشەویستی و سەرنجی دایکی بۆ لای خۆی راکێشێ. بەڵام خەڵاتێک کە من بە بۆنەی بە خودامیزتن و میزاوی کردنی نوێنەکانی دەم دایە، ئەوی هان دەدا بە ساوایی بمێنێتەوە. تا لەم رێگایەوە بە شێوەیەکی سروشتی مەیلی لەسەر ساوایەتی و حەز کردن لە ساوا بوونی خۆی لابچێ و ئیدی لە ساوا بوونەوە تێر بێ. ئەگینا تەمبێ کردن و ئامۆژگاری و خەڵات و دەسخۆشانە هیچ دەردێک دەرمان ناکەن. لە کورتیی بڕمەوە ئەو کوڕە زۆر زوو ئیشتیای ساوا بوونەوەی لە کەللە دەرهات و عادەتی میزاوی کردنی جێ و بان و مەلافەکانی وەلانا.

لێرەدا بەجێیە وەبیر بێنمەوە کە ئەگەر هاتبایە دایکی ئەو کوڕە لە هاوفیکری و هاوکاری لەگەڵ من خۆی پاراستبا، گیروگرفتەکەش بەو هاسانی‌یە چارە نەدەکرا. لێک تێگەیشتن و هاوکاریی نێوان راهێنەران و دایک و بابەکان کارێکی ئەوەندە هاسانیش نیە. زۆر لە دایک و بابەکان ئامادە نین هیچ چەشنە هاوکاری‌یەکیان لەگەڵ راهێنەر یان دەروونناس‌دا هەبێ و پێیان وایە ئەو جۆرەی ئەوان بیر دەکەنەوە و ئەو شێوە عاملاندنەی باوەڕیان پێیەتی، لە هەموو عەیب و کەم و کووری‌یەک بە دوورە. دەزانم کە هەر یەک لە ئێمە بیر و باوەڕ و بۆچوونی تایبەت بە خۆمانمان هەیە و بەو بایەخانە کە خۆمان هەمانن، کەسانی دیکە هەڵدەسەنگێنین. بۆ وێنە ئەمن خۆم ئەوەم پێ باشە کە منداڵ بە جل و بەرگێکی تەواو خۆڵاوی‌یەوە بەڵام کەیف خۆش و دەم بە بزە لە کایە و یاری کردن بگەڕێتەوە. کەچی زۆر لە دایک و بابەکان پێیان خۆشە پێش بە یاری کردنی منداڵانیان بگرن و «عاقل» و ئارام لە گۆشەیەک دایان نشێنن تا جل و بەرگەکانیان پیس نەبن. ئەو دایک و بابانەی دەیانەوێ بە یاری باش‌دا ئاڵ و گۆڕ بەسەر پێوەندیی خۆیان و منداڵانیان دا بێنن،

دەبێ لە کـــاتی تووڕە بوون لەواندا لە پیشدا لە بارەی هۆی ئەو تووڕەیی‌یەوە پرسیار لە خۆیان بکەن. بۆ وێنە لە خۆیان بپرسن کە داخوا لەبەر دم بە دمە لەگەڵ خیزانیان نیە کە ئێستا لە منداڵەکەیان تووڕەن. یان گوڕاندنیان بەسەر منداڵەکەیاندا هی ئەوە نیە کە دراوسێکەیان ساتێک یان چەند سەعات لەوەبەر لەگەڵیان بە کێشە هاتبوو، یان بڵێی هۆی ئەو بەد ڕەفتاری‌یەیان لەگەڵ منداڵەکەیان، بەسەردا ڕووخانی سەرۆکی ئیدارەکەیان لە وەختی کاری ئیداری دا نەبووبێ؟ لەوانەشە هێندێک هۆی دیکەی دەروونی بن کە بە هاسانی نەتوانین دەست نیشانیان بکەین. بۆ وێنە هۆی بەدرەفتاریی یەکێک لەگەڵ منداڵەکەی رەنگە ئەوە بێ کە دایک و بابی ئەویش ئەویان بە تەربیەتێکی وشک و تێکەڵ بە لێدان و لێ تووڕە بوون ڕاهێناوە و بەردەوام لە سزا و تەمبێی دنیای دیکە ترساندوویانە و زۆر جار ناچاریان کردوە ڕێز بۆ ئەو ڕێ و شوێن و داب و نەریتە کۆمەڵایەتی‌یانە دابنێ کە بایەخێکی ئەوتۆیان نیە. (مەمانان بۆ عاملاندنی منداڵانمان ئەو شێوە و ڕێگایانە بەکار دێنین کە دایک و بابەکانمان بۆ پەروەردە کردنی ئێمە بەکاریان هێناوە. هێنانە گۆڕێ ئەم جۆرە پرسیارانە و دەیان و سەدان پرسیاری دیکەی لەم چەشنە یارمەتیی دایک و بابەکان دەدەن تا بە ئاگایی‌یەکی زیاترەوە بۆ ناسینی گیروگرفتەکانی منداڵانیان هەنگاو بنێن و لە خوت و خۆڕایی ئەوان تەمبێ نەکەن.

بۆ ئەوەی منداڵانی سەربەخۆمان هەبن، دەبێ زۆر لە وەختی خۆمان بۆ ڕاگەیشتن بەوان تەرخان بکەین. بەتایبەتی تا منداڵ دەگاتە تەمەنی دوو ساڵی. کاتێک ساوایەک دەلانکێ دەنرێ و چەند سەعات ئاوڕی وەسەر نادرێ، کردەوەیەکی پڕ مەترسی دەرحەقی وی ئەنجام دەدرێ. چونکە ئێمە ئاگامان لەوە نیە کاتێک ساوا لە خەو ڕادەبێ و کەس لە لای خۆی بەدی ناکا، لەوانەیە هەست بە چ ترس و وەحشەتێک بکا.

ئەگەر دەتانەوێ منداڵەکەتان ببێ بە ئینسانێکی سەربەست و سەربەخۆ و دوور لەنارەحەتی یەدەروونی یەکان گەورە ببێ، لەدووسالیّ هەوەڵی ژیانی‌دا نابێ زۆری لێ دوور بکەونەوە. لەسالأنی دواتریش‌دا هەوڵ بدەن یاریی زۆر لەگەڵ بکەن. نەک وەک ئینسانی گەورە، وەک منداڵێک و بە وەبیرهێنانەوەی سەردەمی منداڵیی خۆتان تێبکۆشن خۆتان منداڵ کەنەوە تا بتوانن بچنە نێو جیهانی منداڵیی ئەو و وەک منداڵێک یاریی لەگەڵ‌دا بکەن.

دایک و بابەکان دەبێ شت چۆن هەیە ئاوای ببینن و لەو راستی‌یە ئاگادار بن کە منداڵەکانیان درەنگ یان زوو، ئەوان بەجێ دێڵن. مەبەستی من ئەوە نیە کە ئەوان دەڕۆن و ئیدی ناگەڕێنەوە لای دایک و بابیان. مەبەستم ئەوەیە کە ئەوان لەباری دەروونی‌یەوە، لە دایک و بابیان دادەبڕێن و ئەو بەستراوەیی‌یە منداڵانەیەی لە سەردەمی منداڵی‌دا بەسەریان‌دا زاڵە، وەلا دەنێن. دیارە ئەوەشیان شتێکی سروشتی‌یە کە دایک هەوڵ بدا منداڵەکانی بەستراوە بە خۆی رابێنێ. بەلأم یاسای سروشت وا دەخوازێ کە ئەوان بۆخۆیان نەسلێکی تازە پێک بێنن و بە رێی خۆیان‌دا بڕۆن.

ئەوە کارەساتە کە هێندێک دایک و باب منداڵانیان وەک مڵک و ماڵ و خۆیان وەک خاوەن مڵک چاو لێ دەکەن و ئەو حەقە بەخۆیان دەدەن کە هەرچی‌یەکی پێیان خۆشە دەرحەقی ئەوان ئەنجامی بدەن و بێ سەرنج دان بە ئۆگریی ئەوان بڕیار بۆ داهاتوویان دەدەن. لەوەش خراپتر ئەوەیە کە پێیان وایە هەر کارێکی دەی‌کەن لە هەرچی عەیب و کەم و کووڕی‌یە بە دوورە و هەمووی بە قازانجی منداڵەکانیانە. ئاواتی من ئەوەیە نەسلی نوێ کە باشتر لە نەسلەکانی پێشوو منداڵ و دەروونناس دەناسێ، سادقانە بتوانێ لە رێگایەکی ئینسانی‌تردا هەنگاو بنێ و منداڵانی ئازاد و سەربەخۆ پێ بگەیەنێ.

# فەسڵی حەوتەم:

## پرسیار و وەڵام

* ئازادی ، نەک بەرەڵڵایی

## ئازادی نەک بەرەڵڵایی

چلۆن دەکرێ سنووری نێوان ئازادی و بەرەڵڵایی روون بکەینەوە؟
بلاّو کەرەوەی کتێبەکەم داوای لێ کردووم بۆ روونتر کردنەوەی شێوەی راهێنانی منداڵانی ئازاد، هێندێک زیاتر بۆ خوێنەران بدوێم. ئەو دەڵێ: زۆر لە دایک و بابەکان، دوای ئەوەی لە خوێندنەوەی کتێبەکە بوونەوە وا هەست دەکەن کە شێوەیەکی دروستیان بۆ راهێنانی منداڵەکەیان بەکار نەهێناوە. ئەوان بۆ قەرەبوو کردنەوەی هەڵەکانی رابردوویان، بە جارێک پێشی منداڵانیان بەرەڵلاّ دەکەن تا هەر کارێکی پێیان خۆشە ئەنجامی بدەن. لە ئاکامدا ئەو منداڵانە دەبن بە کەسانێکی رووهەڵماڵاو و ئاژاوەگێڕ و گیروگرفتی تازە بۆ دایک و بابیان پێک دێنن. چونکە زۆر لە دایک و بابەکان تێگەیشتنێکی دروستیان لە مانای ئازادی نیە. ئەوان هێشتا لەوە نەگەیشتوون کە ئازادی واتە پێوەندیی دوو لایەنە لە نێوان منداڵ و دایک و بابدا، ئازادی دان بە منداڵ بەو مانایە نیە کە ئەو هەرچی پێی خۆشە، دەتوانێ ئەنجامی بدا. زێدە ڕۆیی کردن لە ئازادی دا بتەوێ و نەتەوێ سەرەنجامەکەی بەرەڵلایی و هەرکەس هەرکەسی دەبێ.

بە بڕوای من ئازادیی هەر کەسێک ئەو کاتە مانایەکی دروستی هەیە کە ئازادیی کەسێکی دیکە زەوت نەکا. بۆ وێنە لە قوتابخانەی ئێمە، قوتابییەک ئازادە بچێتە سەر کەلاسی خوێندن یان نەچێ و لە حەساری قوتابخانە یاری بکا. چونکە ئەو کارەی ئەو زیان بە کەسێکی

دیکە ناگەیەنێ و ئازادیی کەسیش زەوت ناکا. بەڵام ئەو ئازادییەی نیە لە ژووری خوێندندا شەیپوور لێ بداو یان کاتێک ئەوانی دیکە خەوتوون گۆرانی بڵێ. چونکە ئەم کارانەی دەینە هۆی پێ شێل کرانی ئازادیی ئەو قوتابیانەی دەیانەوێ دەرس بخوێنن یان دەیانەوێ بحەسێنەوە.

لە سەفەرێکمدا بۆ ئەمریکا بۆم دەرکەوت کە ژمارەیەکی زۆر لەو دایک و بابانەی میتۆدی راهێنانی ئازادانەی منداڵانیان گرتۆتە بەر، لەراستیدا منداڵانیان،ئاژاوەگێر رادێنن. کاتێک دەمەویست لەگەڵ دایک و بابەکان بدوێم، ئەوە منداڵەکان بوون کە بڕیاریان دەدا لە بارەی چ مەسەلەیەکەوە بدوێین. بە کورتی ئەوان هەموو شتێکیان لە پاوانی خۆیان گرتبوو و بیروڕای خۆیان بەسەر دایک و بابیاندا دەسەپاند.

کاتێک ئەمن لەگەڵ قوتابیان لە قوتابخانەدا پێکەوە خەریکی کارێکین و کەسێک بۆ راوێژ و قسە و باس لەسەر مەسەلەیەک دێتە لای من، ئەگەر پێم خۆش نەبێ منداڵان لەو باسەدا بەشدار بن، زۆر بە هاسانی داوایان لێ دەکەم بە جێمان بێڵن و ئەوانیش بێ هیچ پرتە و بۆڵەیەک دەورەمان چۆل دەکەن.

دەبێ ئەوەش وەبیر بێنمەوە کە ئەو مافە بۆ قوتابییەکانیش هەیە. بۆ وێنە کاتێک ئەوان پێکەوە خەریکی قسە و باسن و حەز ناکەن ئەمن بەشداری باسەکەیان بم، زۆر بە هاسانی داوام لێ دەکەن بەجێیان بێڵم، منیش لە داواکەیان دەرناچم.

منداڵان هەر لە جێدا خۆ خوازن. بۆ هەر منداڵێک «من» لە هەموو شتێک گرنگترە. دایک و بابەکان دەبێ قبووڵ کەن کە ئەو خۆ خوازییە بۆ پێشچوونی قۆناغەکانی گەشە کردن و کامڵ بوونی منداڵ، شتێکی تەواو پێویستە. بۆ وێنە ئەگەر منداڵەکەتان ئامرازێکی بە مەبەستی وەکار خستنەوەی دووچەرخەکەی یان دروونی جل و بەرگ بۆ بووکە باغەکەی داوا کرد، ئامرازەکەی بدەنێ بەڵام پێی بڵێن: هەرکات کارەکەی خۆت پێ

جێبەجێ کرد، لە جێی خۆی دانێوە یان تەحویلی ئێمەی بدەوە. ڕەنگە لە ڕوانگەی ئێوەوە ئەم کارە جۆرێک نەزم و یاسا بێ، بەڵام ئەمن پێم وایە ئەوە جۆرێک پێوەندیی نێوان ئەندامانی بنەماڵەیە کە بۆ هاوهەنگاویی زیاتر لە نێو ژیانی بنەماڵەیی‌دا پێویستە.

منداڵان بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی «انضباط»ی فەردی، بە ناچار دەبێ هێندێک هەڵسووران و چالاکی‌یان هەبێ. ئەگەر ڕێی ئەنجام‌دانی هەموو جۆرە چالاکی و هەڵسوورانێکیان لێ بگرین، ئەوان چۆن فێری «انضباط»ی فەردی دەبن؟

زۆر لە خوێنەران، دوای ئاشنا بوون لەگەڵ بۆ چوونەکانی من لە بارەی ئازاد ڕاهێنانی منداڵان، ژمارەیەکی زۆر نامەیان بۆ ناردووم و گەلێک پرسیاریان لێ کردووم. ئەم پرسیار و وەڵامانە کە لە لاپەرەکانی لەمەودوادا دێن، کورتەی ئەو نامانەن کە هەوڵم داوە بەلەبەر چاو گرتنی ئەو ئەسڵ و ڕێ و شوێنانەی قوتابخانەکەمانی پێ بەڕێوە دەبەین و بەسەرنج دان بەو شێوە پەروەردە کردنەی بۆ خۆم لەوێ بە کاری دێنم، وەڵامیان دەمەوە. (*)



(*) فەسڵی حەوتەمی ئەم کتێبە لە پێشەکی‌یەک و چەندین پرسیار و وەڵام پێک هاتوە. لەبەر ئەوەی لەنێوەرۆکی وەڵامەکانی دوکتور نیل بە پرسیارەکان دا، تا ڕادەیەکی زۆر ئەو شتانە گوترزاونەوە کە لە ٦ فەسڵی ڕابردووی ئەم کتێبە دا هاتوون، پرسیار و وەڵامەکانم نەخستە سەر ئەم بەشەی کتێبەکە. هەر کات دەرەتانی چاپی بەرگی دووهەمی ئەم کتێبەم بە زمانی کوردی بۆ ڕەخسا، لەگەڵ پاشماوەی کتێبەکە بڵاوی دەکەمەوە.
(وەرگێڕ)

# پێڕست

فەسڵی سێهەم:

## مەسەلە جینسی‌یەکان



فەسڵی چوارەم:

## مەسەلە ئەخلاقی‌یەکان



فەسڵی پێنجەم:

## گیرو گرفتەکانی منداڵان

فەسڵی شەشەم:

## گیرو گرفتەكانی دایك و باب



فەسڵی حەوتەم:

## پرسیار و وەڵام

# Education of Free and Independent Children

First Volume

Written by
D.A.S. NEIL

Translated from Persian by
Qdir Wirya

Issued by: Hiwa Cultural Centre

له سەر ئەرکی مەڵبەندی ڕۆشنبیری هیوا بە چاپ گەیەنراوە